


سێدا ئێرۆلو



# باشەکان لەدەست نادەن، لە دەست دەدرێن

"لێخۆشبوون و لەبیرکردن، تۆڵەی مرۆڤە باشەکانە"

وەرگێڕانی: لینا ڕزگار

چاپی دووەم

باشەکان لەدەست نادەن،
لە دەست دەدرێن



# باشەکان لەدەست نادەن، لە دەست دەدرێن

نوسینی؛ سێدا ئێرۆلو
وەرگێڕانی؛ لینا ڕزگار



ناوی کتێب: باشەکان لەدەست نادەن، لە دەست دەدرێن
بابەت: ڕۆمان
نووسەر: سیدا ئێرۆلو
وەرگێڕ: لینا ڕزگار
پێداچونەوە: سیروان سلێمان
دیزاین: هەرێم عوسمان
قەبارەی کتێب: ١٣سم * ٢١سم
چاپ: چاپخانەی چوارچرا
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم
ساڵی چاپ: ٢٠٢٣ ز

لە بەڕێوەبەرێتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (١٢٧٦) ی ساڵی ٢٠٢٣ ی پێدراوە






کتێبخانەی گۆڵدن بووك
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
07701598762 - 07501444434
Golden book  ktebfroshe_warzer
Warzer_Book  Ktebfroshe_warzer



"

بۆ هەموو پارچە شکاوەکانی ناخم...

بۆ باوکم کە بە تەواونەکراوی بەجێیهێشتین،

لە کاتێکدا زۆر شتی ترمان هەبوو بۆ هاوبەشیکردن...

"

## سوپاس...

ئەگەر ژیان گەشتێک بێت، ئەم کتێبە پێشکەشە بەوانەی لەم گەشتەدا یاوەریم دەکەن، بۆ ئەوانەی وام لێدەکەن تەنیاییم خۆش بوێت، بۆ ئەوانەی هێزیان بە لقەکانم دەدا کاتێک هەستم بە لاوازی دەکرد وەک دارێکی پاییز، بۆ ئەو ئەزموونانەی بە هەوڵدان بەدەستم هێنا، بۆ ئەوانەی فێریان کردم هەموو شتێک و هەموو کەسێک وەک خۆی قبوڵ بکەم، کە بووەتە فەلسەفەی ژیانم، بۆ ئەوانەی وایان لێکردم بزانم کە دەتوانرێت جیهان بە زەردەخەنەوە دروست بکرێتەوە. بۆ خێزانەکەم، کە یارمەتییان دام جێپەنجەیەک لەسەر داهاتوو بەجێبهێڵم، بۆ کچەکەم، "مێلیس دێرین"، کە منی بە ئامانجەکانمەوە بەستەوە و دایکایەتی کردە تاکە واقیعم، بۆ ئازیزانم.

بۆ خوێنەرانم کە میوانی جیهانەکەمن، کە بە ڕستە دروستم کردووە، بۆ هەموو هەستێک کە ژیان مانادار دەکات، بۆ ئەو هیوایانەم کە هەرگیز لەدەستم نەداوە و بۆ باوەڕە هەمیشەییەکانی من، بۆ هاتنی ڕۆژە خۆشەکان، بۆ ڕۆحم، بۆ خودی خۆم، بۆ پایز و باران و عەشق.

سوپاس.

"به جانتایەکی پڕ لە چیرۆکەوە دەستدەکەم بە ڕێگاکەم، نازانم قەڵەمەکەم دەتوانێت فریا بکەوێت یـان ئایا کامیان دەگاتە دەستت؟ تەنیا دەمەوێت بزانیت؛ ڕۆژێک دێت بە دڵنیاییەوە لە چیرۆکێکدا باست دەکەم."

> مرۆڤ لە ئازارەکانیاندا تەنیان
>
> فریدا کاهلۆ

## لەکاتی دەستپێکردندا...

## "وەرە با گەشتێکی دوور بکەین لەگەڵ تۆ"

هەموو بەیانییەک، بە ئارەزووی ئەوەی چەند کاتژمێرێک بۆت بنووسم، لە شوێنێکی بەتاڵی شەمەندەفەرێکەوە کە نازانم بۆ کوێ دەڕوات لە خەو هەڵدەستم. من دەمەوێت بەناو ئەو شارانەدا تێپەڕبم کە بەهار هەموو جلە گوڵاوییەکانی لەبەر دەکات و چی هەیە و نیە بۆتی باس بکەم، بۆت باسبکەم کە ئەو خولەی کە پێی دەگوترێت "ژیان" هەمیشە لە هەمان ڕۆتین نامێنێتەوە، هەندێک جار دەتوانیت بگەیتە هەورەکان لە دڵخۆشیدا، بەڵام هەندێک جار بۆ ئەوەی ئازاری دڵت لەبیر بکەیت، ڕەنگە سەرت بسوورمێت لەوەی چی بکەیت، وە بۆت باسبکەم چۆن چەمکی لەدەستدان دەتوانێت بەهێزت بکات، و چەندانی تر...

ئەمەوێت ئەو ڕۆژە ئەمڕۆ بێت!

تازە فێربووم کە هەندێک جار پێویستە هەموو دەنگەکان بێدەنگ بکرێن و ئەوەی لە ناوەوە کەڵەکە کراوە دەربڕدرێت، قسەکردن شتێک نییە وەک گێڕانەوە، دەمەوێت لەسەر ئەو کەسانە بنووسم کە جێپەنجەی خۆیان لەسەر من بەجێهێشتووە.

پاشان سەیری ئەوە دەکەم کە چیم کۆکردوەتەوە، چیم لەناو جانتاکەمدا جێ کردوەتەوە کە هەمیشە لەگەڵ خۆمدا هەڵیدەگرم؟ دەستکەوتەکانم چین؟ چیم لەدەست داوە؟ چی فێربووم؟ لە کام وێستگەدا وەستام؟ بۆ کام سەرکەوتن ئاهەنگم گێڕا؟ منیش بەئەندازەی تۆ مەراقم هەیە کە خەریکە چیت بۆ باس دەکەم...

لەو کاتەوەی کە زەروورەتی تەنیاییم بۆ چوونە قووڵایی دۆزیوەتەوە، بە جۆرێکی تر سەیری هەموو شتێک دەکەم، گوێم لە دەنگێک دەبێت کە لەگەڵ خەڵکدا ناتوانم بیبیستم، بیر لە وردەکارییە بچووکەکان دەکەمەوە کە پێشتر هەرگیز گرنگیم پێ نەداوە، زیاتر بیر دەکەمەوە و زیاتر دەنووسم و زیاتر تێدەگەم، چونکە ژیان ئەوەندە سادە نییە کە بە بێ بیرکردنەوە لێی تێبگەیت، بۆ ئەمەش پێویستە کەمێک بگەڕێیتەوە بۆ ناخی خۆت، گوێ لە دەنگەکان بگریت کە لە ناختەوە بەرز دەبنەوە... لەگەڵ تەنیایی و دوورکەوتنەوە لە قەرەباڵغی ناپێویست باوەڕ بەو شتانە ناکەیت کە دەیدۆزیتەوە، کاتێکی زۆرمان نییە،

گەشتەکەمان تازە دەستی پێکردووە، دەنگێکی نزم دێت و دەڵێت؛ وەرە با لەگەڵ تۆدا بچینە گەشتێکی دوور، با گەشە بکەین و پێبگەین بە هەنگاونان بەسەر یادەوەرییەکانمان و ئازارەکانمان.

با جارێکی تر قبوڵی بکەین کە کات هەموو برینێک سارێژ دەکات، و دواتر هەمیشە هیوای ڕۆژانی باشترمان هەبێت، با هەمیشە باوەڕمان بەوە هەبێت کە دەکرێت سبەینێیەکی باشتر هەبێت. با لە ڕابردوو ڕزگارمان بێت، با ئەمڕۆ ناڕەزایی و تووڕەیی خۆمان بەجێبهێڵین، با لەو شوێنەی کە وازمان هێنابوو بەردەوام بین، بۆ ئەوەی جوانترین ژیان بژین کە پێشکەشمان کراوە.

دەزانم منداڵە بچووکەکەی ناخت بە چەندین شت زیز بووە، دەزانم جەستەت تەمەنی زیاد بووە، بەڵام هەمیشە ناخت بەو شێوەیە ماوەتەوە، ئەگەر وانەبووایە ئەمڕۆ لەم دێڕانەدا بەیەک نەدەگەیشتین، ئەی وانیە؟

ئەوەی ئێستا دەبێت بیکەیت ئەوەیە، هەموو دەنگەکان بێدەنگ بکەیت و خۆت بۆ ئەم ڕێگایە بەجێبهێڵیت، لەم گەشتەدا چیرۆکی خۆت دەدۆزیتەوە، چونکە لە کاتێکدا ئێمە هەمیشە بارودۆخی هاوشێوەمان بەسەردا دێت، پێمان وایە ئێمە تەنها بەسەر ئێمەدا دێت، هەڵەیەکی گەورەیە! چیرۆک و ئازارەکانی

زۆربەمان لەیەک دەچن، هەر بۆیە لەم کتێبەدا خۆت دەبینیتەوە، لەبیرت بێت ڕەنگە جارێکی تر ئازار بچێژیت، بەڵام لە کۆتاییدا بەهێزتر دەبیت، تۆ تۆیەکی بەهێزتر لە تووڕەیی و شکاوی و برینەکانت دروست دەکەیت، لەوانەشە لەگەڵیان ڕاببێیت بژیت.

خوای گەورە دەفەرموێت؛

هەرکەسێکت لە من زیاتر خۆشبوێت، لێت وەردەگرمەوە.

مەڵێ بەبێ ئەو ناژیت، وات لێدەکەم بەبێ ئەویش بژیت. وە وەرز تێدەپەڕێت، لقەکانی ئەو درەختانەی سێبەر دەبەخشن، وشک دەبنەوە، تەنانەت ئەو کەسەی بە گیانی خۆتی دادەنێیت ڕۆژێک دێت دەبێتە دەستت، سەرت دەسووڕمێت، هاوڕێکەت دەگۆڕێت بۆ دوژمن. دوژمن هەڵدەستێت و دەبێتە دۆستت، جیهانێکی وا سەیرە، هەرچی دەڵێیت ناکرێت ڕووبدات ڕوودەدات. دەڵێیت ناکەوم، کەچی دەکەویت، دەڵێیت سەرسام نابم، بەڵام سەرسام دەبیت، وە ئەمە سەیرترین شتە؛ هەرچەند دەڵێیت مردم ئیدی، بەڵام دووبارە دەژییتەوە.

سەرەتا ئەوەی تۆ دەیڵێیت ڕوونادات، ڕوودەدات. پاشان ئەوەی گوتت ناڕوات دەڕوات. لە کۆتاییدا ئەوانەی دەترسیت بڵێیت نامرن، دەمرن، وەک ئەوە وایە هەر ئازارێک بەراورد بکرێت بە ئازارەکەی پێشووتر، ئەمە؛ شێوازی ژیانە بۆ تاقیکردنەوەی هێزی خۆی.

"لەبیرکردنەکانت هەنگاوێکە بەرەو ئەوەی شتە باشەکانت لەبیر بێت، ناتوانیت بوار بۆ شتە تازەکان بکەیتەوە بەبێ ئەوەی کۆنەکان لەبیربکەیت."

“

هەموومان چیرۆکێکین، ڕۆژێک دێت
بە دڵنیاییەوە کۆتاییمان پێدێت...

”

ئەو ماڵەی کە دەرگاکانی بە چاوەکانم زەبەلاح دەردەکەوت و ڕەنگە سەوزەکەی هەموو ئاسۆی منی دەگرتەوە، ئەها ئەو خانووانەی تەنها دوو ژوور و چێشتخانەیەکی بچووکی تێدایە، باخچەیەکی بچووکی تێدایە... ئەوە یەکەم شتە کە لە بیرم دێت لە منداڵیمدا.... دەستپێکی چیرۆکەکەم لەوێدایە... ڕەنگە ئەوە لە مندا بەڵگە بێت لەسەر ئەو ڕاستییەی کە مرۆڤ یەکەمەکان لەبیر ناکات ...

هەرخۆی منیش زوو شت لە بیر دەکەم، من باشم لە لەبیرکردنی هەموو شتێک، و هەموو ئەو کەسانەی کە ناڕەحەتم دەکەن و ئازارم دەدەن، نووسەرێک لە کتێبێکدا نووسیبووی کە؛ ئیرەیی بەو کەسانە بردووە کە دەیانگوت؛ "دەتوانم هەر شتێک لەبیر بکەم کاتێک دەمەوێت لەبیری بکەم" و باسی ئەوەی دەکرد لەبیرکردن لێهاتووییە.

کاتێک ئەو بابەتەم خوێندەوە، زەردەخەنەیەکی گەورەم خستە سەر دەموچاوم و شانازیم کرد، گوتم؛ "پێموایە ئەو توانایەم هەیە". پێم وایە هێشتا توانای ئەوەم هەیە ئەمە بکەم، چونکە لەبیرکردنەکانم هەنگاوێک بوو بەرەو ئەوەی شتە باشەکانم لەبیر بێت، وە هەروەها ئەو شتانەی کە هەرگیز لەبیرم نەکردووە... وەکو منداڵیم... یەکەمین گەشتم، یەکەمین پێڵاوم، یەکەمین هاوڕێم، یەکەمین خۆشیم، یەکەمین قوتابخانەم،

یەکەمین سەرکەوتنم، یەکەمین برینم، یەکەمین خۆشەویستیم، یەکەمین بێهیوایی بوونم. یەکەمین هیوام، یەکەمین ماچم، یەکەمین وازهێنانم، یەکەمین یاخیبوونم، یەکەم...

مرۆڤ ئەم هەموو یەکەمینەی هەیە، کاتێک بینیم کۆشکی منداڵیم لە شوێنێک لە دوورترین گۆشـەی ئیستەنبوڵ لە خانوویەکی بچووک پێکهاتووە، بۆم دەرکـەوت کە هەموو بیروباوەڕەکانم دەکرێت ڕۆژێک بگۆڕدرێن، کە ئەوەش یەکێک بوو لە یەکەمەکان، بەڵام ئێمە لەنێو ئەو کەسانەدا بووین کە بە ژیانی نمونەیی پاداشتمان پێدرابوو. کچی باوکێکی پڕ لە زانیاری، کە پیشەیەکی هەیە بە ئاستێکی بەرزی ڕێزگرتن لە ناو کۆمەڵگا، و دایکێکی نموونەیی بە بەزەیی، و دایکایەتی و خۆفیدایی خۆی، وە بوون بە خوشکە گەورەی برایەکی شیرین... قووتابیەکی سەرکەوتوو... ڕۆڵەکانم جوان بوون... بچووکترین خانوو کە تا ئێستا بینیبێتم ئەو خانووە سەوزە بوو.

خانووەکان بە تێپەڕبوونی کات گەورە بوون، خەڵک هاتن و دەرچوون لە خێزانەکەمان، یادەوەرییەکان کۆدەکرانەوە، زەردەخەنەکان زیادیان دەکرد، پاشان نەخۆشییەک هاتە ژیانمانەوە، بە هاواری ئەوەی کە هەموو شتە باشەکان کۆتایی دێت... ئێمە لە تەمەنێکدا بە شێرپەنجە ئاشنا بووین کە منداڵێک

نەیدەتوانی لە چەمکی نەخۆشی تێبگات، چ برینێک دەتوانێت هێندەی نەخۆشی دایک ئازاری ئەژنۆی منداڵەکانمان بدات؟

هەمیشە دڵمان زۆرترین ئازاری چەشتووە، منداڵان کەشتی کاغەزییان دروست دەکرد و پڕیان دەکرد لە هیوا، بەڵام بەشی ئێمە ئەوە بوو ئەو کەشتییانە لە فرمێسکەکانماندا نووقم بکەین، یەکەمەکانم بەم شێوەیە بەردەوام بوون، بۆ یەکەم جار ترسام، بۆ یەکەم جار هەستم کرد دەدۆڕێم، بۆ یەکەمجار نەمتوانی چیرۆکێک بدۆزمەوە تا ئازارەکانم کەم بکاتەوە.

زۆر دواتر تێگەیشتم؛ لە کاتی منداڵیدا، گەورەبوون لە ترسی لەدەستدانی ئەو کەسانەی خۆشتدەوێن لە دوایدا چ وێرانکارییەک بەجێدەهێڵێت، کاتێک هاتین بۆ شارێکی تر بۆ چارەسەری دایکم، زۆر پرسیارم لە خۆم دەکرد، بۆچی باوکێک بۆ خێزانەکەی ئامادە نابێت لە کاتێکدا زۆرترین پێویستییان پێیەتی؟ ئەو سەردەمە بوو کە تیرۆر لەو وڵاتەدا پەرەی سەندبوو.

هەرگیز هەستم بەو بێدەسەڵاتییە نەکردووە کە هەستم پێدەکرد، کاتێک قژی دایکم دەتاشی، ئەو ڕۆژە بۆ یەکەم جار فێری گریان بووم بە نهێنی، وە بۆ شاردنەوەی منداڵێتیم لە پشت پەنجەرەیەکەوە...

لە چاوەڕوانی ئەو ڕۆژەی دایکم باش دەبێت دە ساڵم تێپەراند، منیش وەک هەموو منداڵێک چەندین جار کەوتووم،

بەڵێ، کەس بە پاڵەوانیی لەدایک نابێت، بەڵام ئەو یەکەم کەوتنە فێری کردبووم کە جارێکی تر کە دەکەوم چۆن هەست بە ئازار بکەم لە ئەژنۆکانمدا، ئازارەکانی دواتر زۆر ئاشنا بووبوون، چەند ساڵێک بە سەرکەوتنێکی گەورەدا تێپەڕی، لەژێر ئەو ئارامییەی کە پێی دەڵێم دیاری ژیان بۆ من، زانکۆ، پیشە، ڕاهێنانەکان... هەموو شتێک بە تەواوی وەک پێویست پێشکەوتن، دایکم باشتر بوو، جارێکی تر قژی کورت نەکردەوە، بەڵام ئەو منداڵە شکاوەی ناو من هەمیشە لە شوێنێک خۆی حەشاردا کاتێک کچێکم بوو، هیوایەکی نوێ بۆ ئەو منداڵەی لە ناخمدابوو لەدایک بوو، ئەو منداڵە بچووکەی ناخم دەیتوانی هەموو ئەو کارانە بکات کە لە منداڵیدا وازی لێهێناوە، جارێکی تر منداڵ ببێتەوە و ڕووشیدا...

ئەو کچە شکاوەی ئاشت کردەوە لەگەڵ ژیاندا، بێ ئاگا لەوەی کاتە خۆشەکانی زۆر ناخایەنێت، لە کاتێکدا هیواکان جوانترین میوەن کە لە کێڵگەی مرۆڤدا دەڕوێن، بەڵام هەمیشە ناچار بووین لەسەر جوانترین کەشتییەکان بیانخەینە خوارەوە، سەرەتا ئەوەی گوتم ڕوونادات ڕوویدا، پاشان ئەوەی گوتم ناڕوات ڕۆیشت.

لە کۆتاییدا ئەوانەی دەترسام بڵێم نامرن مردن، وەک ئەوە بوو هەر ئازارێک بەراورد بکرایە بە ئازارەکەی پێشووتر، چەندین ڕۆژ بەرەنگاریم کرد.

ئەو لێدانانەی لە ئەژنۆکانمەوە دەمخوارد، گەورەتر و گەورەتر دەبوون، وەها برینێکم بۆ هات کە هەریەکەیان لە چیرۆکەکەمدا کاریگەرییان بەجێهێشت، هەریەکەیان لەناو حەوزی ئەزموونەکانمدا بوونە ماسییەک، ئەگەر ئەمڕۆ هەنگاوەکانم بە بەهێزی بنێم، ئەوە لەبەر ئەوەیە کە بە ئازاری کەوتنەکانم ڕاهاتووم، ئەگەر دەتەوێت سبەینێ لە بەرامبەر توندترین بادا ڕاست بوەستیت، ئازاری برینەکانت لەبیر مەکە.

لەو شوێنانەدا گیر مەخۆ کە دەزانیت جارێکی تر لێیدەکەویتەوە، ئازیزەکانت زۆر خۆشبوێت، بەڵام لەبیرت نەچێت مرۆڤەکان هەمیشە دەکرێت بگۆڕدرێن، چاوەڕوانی هەموو شتێک بن لە هەمووان، مەڵێ ڕوونادات، چونکە ڕوودەدات. مەڵێ ناڕوات چونکە دەڕوات.

هەمیشە ئەگەر بهێڵەرەوە بۆ ئەوەی دواتر توشی نائومێدی نەبیت، وە نکوڵی مەکە لەو ڕاستییەی کە پێی دەگوترێت مردن، هاتین، تێدەپەڕین و دەشڕۆین، ئەم ڕاستییە لەبیر مەکە کە هەموومان ڕۆژێک ئەزموونی دەکەین، ئەمڕۆ ئەو کەسەی تەنیشتت خۆش بوێت، ئەمڕۆ ئەوەی دەتەوێت بیڵێیت بیڵێ، ئەمڕۆ کێت ویست لە باوەشی بگری لە باوەشی بگرە، ژیان کورتە لەبیرت بێت، هەموومان چیرۆکێکن، کە ڕۆژێک دێت بە دڵنیاییەوە کۆتایی پێدێت.

## پێنج پیت دوو حوجرە... باوکە...

باوکە... پێنج پیت، دوو حوجرە... وشەیەکە بۆ تەمەنێک... هەرگیز وشەیەکی ترم لە ژیانمدا نەبووە کە وەک گرێیەکی گەورە لە قورگمدا گیر بووبێت، گوتم؛ "باوکە"، ئەو وشەیە دەیزانی لە کوێدا خۆی گرێ دەدا، وەک ئەوەی گەورەترین خەم بێت، دەڵێن کاتێک منداڵێک لە لاوازترین تەمەنیدا باوکی هەنگاوەکانی دوور دەخاتەوە، ئەوا بە تەنیا دەبوو، کەس ئەوەی نەدەتوانی بزانێت

پەنجەرە واتە هیوا بۆ منداڵێک، واتە هیوادان بەو کەشتییانەی کە لەبەردەم پەنجەرەکەدا ڕیزکراون و چاوەڕێی ئەو سێبەرە بکەیت کە هێواش هێواش لە گۆشەکەوە دەردەکەوێت... چاوەڕێم کرد، وەک هەموو منداڵێک کە باوکی یان دایکی ڕۆیشتووە، منیش چەندین مانگم بە ئەندازەی تەمەنم لەبەردەم پەنجەرەکەدا بەسەر بردووە، نۆ لەو ژمارانەیە کە هەمیشە لە یادەوەری ژیانمدا هەبووە، هەر بۆیە هەرگیز حەزم لێ نەبووە.

٩ی تەمموز بوو کە باوکم ڕۆیشت، تەمەنم ٩ ساڵ بوو، هەرگیز تێنەگەیشتم کە نۆ مانگ چاوەڕێکردن مانای چییە.

من منداڵ بووم، چۆن بزانم ئەوانەی دەڕۆن ڕۆژێک دێت دەگەڕێنەوە، وەک ئەوەی نەیەن ئازارم چەشت، چەندین ڕۆژ دەگریام، وەک ئەوەی باوکم هەرگیز نەگەڕێتەوە، بە هێمنی و بەبێدەنگی... بەبێ ئەوەی دایکم بزانێت، پاشان گریانەکانم لە قوڕگمدا نێژا، بێدەنگتر گریام، دوای ماوەیەک نە توانیم بگریم و نە تێبگەم، کەشتییەکانی بەر پەنجەرەکە سەرەڕای جوڵەی وەرزەکان نەدەچوونە هیچ شوێنێک، هەتا بەیانییەکی بەهار کە تیشکی خۆر بۆ هەموو ڕۆژێکی نوێ دەهێنێت، ئێستا کەشتییەکان دەیانتوانی لە هەر بەندەرێک کە بیانەوێت لەنگەر بگرن. بەڵام ئیتر شوێنی گرێکان لە قوڕگمدا جیاواز بوون، دەڵێم خۆزگە، خۆزگە باوکم هەر دوور بووایە، بەڵام بمانزانیبایە لە شوێنێک هەر دەژی... ئەگەر دوور بووایە هێشتا خەونە بەدینەهاتووەکانمان و ڕستە نەگوتراوەکانمان لەناو خۆماندا دەشاردەوە.

ژیان هەندێک جار زۆر دڕندەیە "ئێمە لەدەستماندا"، بەم شێوەیە تێگەیشتم کە ئەو ڕستانە هەرگیز ناتوانرێت بشاردرێتەوە، ئەگەر بشاردێتیشەوە چەند ئازاربەخشە، باوکم لە دوای خۆی چەندین وەسفنەکردن و دەستخۆشی و ڕستەی نەگوتراو و دەست بەسەر قژداهێنان و ڕوومەتە ماچ نەکراوەکانی بەجێهێشت، ڕۆیشت، ئەو گرێیەی لە قوڕگماندا بوو لەو شوێنە مایەوە.

هیچ هەستت بەوە کردووە قسەکانت لە گرێیەکی گەورەدان

و لە قورگتدا گیر دەخۆن؟ لەو ساتەدا، وەک ئەوە وایە بزانیت ئەگەر ئەو تاکە وشەیە لە لێوەکانتەوە دەربچێت ڕستەکان دەشێوێن ... ئەگەر ئەوە لە تۆدا ڕووبدات، واتای ئەوەیە هێشتا برینێک لەناختدا دەشاریتەوە و هێشتا خوێنی لێدەڕژێت...

پێش ئەوەی ئەو برینە چاکببێتەوە ئازارەکەت ناڕوات، ئەو گرێیەی ناو قورگت تێناپەڕێت، ئەمڕۆ ئەو دەرمانەی کە دەیەوێت پێی بدە، ئەگەر هەر ڕستەیەکی تەواونەکراوت هەیە، تەواوی بکە. ئەو منداڵە شکاوە لە باوەش بگرە کە لەناو تۆدا خۆی حەشارداوە، دەست بە قژیدا بهێنە، پێی بڵێ بە هەموو شێوەیەک لە باوەشی دەگریت، دڵنیابە کاتێک بە باش یان خراپ، ڕاست یان هەڵە، دۆڕان یان بردنەوە، هەموو ئەزموونەکانی قبوڵ دەکەیت، ئەو لەو شوێنەی کە وازی هێناوە بەردەوام دەبێت لە ژیان،

وە من ... ئەی خۆم لێت خۆش دەبم، من لە باوەشت دەگرم وەکو ئەوەی کە هەیت، من لێت خۆش دەبم لە هەموو قسەیەکی نەگوتراوت، بۆ هەموو شتێک کە تەواو نەکراوە، بۆ هەموو ئەزموونە باش و خراپەکانت، بۆ هەموو هەڵەکانت، بۆ ئەوەی کە منداڵەکەی ناخت زیز کردبوو، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە دووبارە لەدایک بیتەوە... ئێستا کاتی ئەوە هاتووە دووبارەت دروستت بکەمەوە.

## مرۆڤ بەپێی کات ڕادێت...

کاتێک تێگەیشتم لەوەی تەنیایی لە هەموو ژوورێکی ساردا هەستی پێدەکرێت، هەرکەسێک پێم وابوو ناڕوات ڕۆیشت، هەرچی پێم وابوو هەرگیز کۆتایی نایەت کۆتایی هات، هەندێک جار مرۆڤەکان ناتوانن وا بیر بکەنەوە کە ئازیزانیان ڕۆژێک دەڕۆن، ئەو کاتە دەکەوێتە ناو گەورەترین هەڵە کە وا بیردەکاتەوە لەوەی ئەوان بۆ هەمیشە لەگەڵیدا دەبن، منیش یەکێک بووم لەوان.

بێگومان بە ئازارە بەیانیەک لەناکاوماڵئاوایی لە کەسێک بکەیت کە ماوەیەکی زۆرت لەگەڵدا بەسەر بردووە، دەزانی هەر وەکو ئەو جۆرە هەستەیە وا لە مرۆڤ دەکات هەست بکات کە لەو بەرزاییانەی کە زۆر لێی دەترسێت دەکەوێتە خوارەوە، دەزانیت کاتێک بەر زەوی دەکەویت، پارچە پارچە دەبیت، بەڵام هێشتا ناتوانیت خۆت ڕابگریت...

منیش کەوتمە خوارەوە، ڕووخام، پارچە پارچە بووم، من گەورە بووم بە کۆسپەوە، وەک منداڵان کە فێری ڕۆیشتن

دەبن، هەر جارێک کە دەکەوتم بەهێزتر هەستامەوە، هەر برینێک لەسەر ئەژنۆم دەهات وایکرد ئەو دێڕانە بنوسم کە ئێستا تۆ دەیخوێنیتەوە، پاشان ڕاهاتم لەسەری، ئەوە فێربووم مرۆڤەکان بە تێپەڕبوونی کات ڕادێن لەسەر برینەکانیان.

ڕۆژێک دێت تۆش فێر دەبیت، دڵنیام ئێستا لای تۆ وا دیارە هەرگیز ڕانایەیت، بەڵام تێدەپەڕێت. ڕۆژێک دێت هەموو شتێک تێدەپەڕێت و باشتر دەبیتەوە.

## ئاسانە کەسێک لەبیر بکەیت کە دڵیت بە ماڵی خۆت قبووڵکردبوو؟

**به ئاگاهاتنەوە لە بەهارێکی تر و لە ژیانێکی دیکەدا...**

لە بەرامبەر مندا، ژیان هەندێک جار شیرین بوو وەک پەشمەک، هەندێک جار توند بوو وەک ئەو شەپۆلانەی بەردەکانی سەر دەریایان قووت دەدا، هەندێک جار نارین بوو وەک ئەو بایەی کە بە نەرمی قژمی دەجوولاند و نازی ڕۆحمی دەکێشا، من هەرگیز نەمتوانیوە وەک مرۆڤی ئاسایی بژیم. بە هەڵە لێم تێمەگە، من بێتوانا نیم، زۆر شتم لە زۆر کەسی تر باشتر کردووە، بەڵام لە هەر شوێنێکی چیرۆکەکەم نەمتوانی بەبەهێزی بمێنمەوە...

"چیم لەدەستدا بوو؟

چی کەم بوو؟

هەر بەڕاستی ئەوەی نەمتوانی ببم چی بوو؟ شکستم هێنا لەوەی ببمە چی؟ تەنانەت نامەوێت بڵێم من چیم کەم بوو؟ نا... نەخێر نایڵێم".

بەتاڵیی شوقەکە کە چەند خولەکێک چاوەکانم لەسەری بوو، لە جاران ساردتر و بێدەنگتر بوو، شاعیرێک گوتی؛ماڵئاوایی سارد و سڕە، هەی کە هەڵەی کردووە، ماڵئاوایی دەتبەستێت، ماڵئاوایی دەتسووتێنێت، ماڵئاوایی وایکرد هەموو کردەیەکی ئازاربەخش هەم بە نۆرە و هەم بە یەکجار هەمووی بژیت لە دوای ئەوانەی ڕۆیشتن، هەستم بە سارما دەکرد، پاشان بەستم، پاشان لەناکاو لەناوەوەمدا هەستم کرد دەسووتێم، وەک ئەوەی گەورەترین دۆزەخ لەمندا هەبێت، مێشکم بێ ئاگا بوو لە هەموو لایەنێکی جەستەم کە لە کەمتر لە خولەکێکدا دەگۆردرا، لە شوێنی خۆی مابوویەوە، ئەو دیمەنەی تازە بینیم نەدەکرا ڕاستەقینە بێت، بەڵێ، نەدەکرا، ناکرێت "ئیمرێ" بڕوات و بەجێم بهێڵێت، مرۆڤ نەیدەتوانی واز لە کەسێک بهێنێت کە دە ساڵی خۆی پێدابوو...

ئاسانە بگوازیتەوە لە دڵی ئەو کەسەی بە ماڵی خۆتت قبووڵکردبوو؟ بەڵام خۆ ئەو تازە گواستبویەوە، هەموو ئەزموونەکانی، هەموو یادەوەرییەکانی، هەموو جل و بەرگەکانی، سی دی یە دڵخوازەکانی، هەموو شتێکی بە بەجێهێشتراوی بەجێهێشت، بە جانتایەکەوە کە چەند شتێکم بە دەستی خۆم خستبووە ناوی، کە تەنانەت بۆ دوو ڕۆژیش بەش

ناكات ڕۆیشتبوو، له ماڵه‌كه‌ی خۆی هه‌ڵهاتبوو، وه‌ك ئه‌وه‌ی ده‌ستێك قوڕگی گرتبێت و هه‌ناسه‌ی لێ ببات.

دوا نیگاكانمان هه‌موو وشه‌كانی كۆتایی پێهێنا، بێده‌نگ بووین، به‌ڵام وه‌ك ئه‌وه بوو قسه‌مان له‌گه‌ڵ یه‌كتر ده‌كرد، چاوه‌كانی ده‌یانگوت ببوره كه ئازارم دایت، كه بێ هیوام كردیت، كه ئیتر نه‌متوانی شه‌ڕ بكه‌م، كه شكستم هێنا، پیاوێكی گه‌مژه‌م؛ هه‌ورێكی زه‌به‌لاحی بێهه‌ستی هاته سه‌ر چاوه‌كانم و دانیشت، شێتانه هاوارم كرد، ته‌نانه‌ت كاتێك پێم وابوو ته‌نها به به‌تاڵی سه‌یری ده‌كه‌م ده‌مگوت؛ تۆ ئه‌وه‌نده‌یت! تۆ ئه‌وه‌نده بێده‌سه‌ڵاتیت. له كاتێكدا من شه‌ڕ ده‌كه‌م و به‌ره‌نگاری هه‌موو شتێك ده‌بمه‌وه، تۆ پیاوێكی ترسنۆك و خۆپه‌رستیت، كه ڕاكردنت هه‌ڵبژارد بۆ ئه‌وه‌ی به‌و شێوه‌یه بژیت كه خۆت ده‌ته‌وێت.

ئێستا بڕۆ ... دڵنیابه ئه‌م ده‌رگایه بۆ هه‌میشه به‌ڕووتدا داخراوه، ده‌ی ماڵئاوا! نه‌خێر له ڕاستیدا ناتوانم وابكه‌م، مه‌ڕۆ تكایه مه‌ڕۆ! وه‌ك بڵێی سه‌ده‌یه‌كی ته‌واو له ژیانماندا تێپه‌ڕی تا به‌رزكه‌ره‌وه‌كه گه‌یشته نهۆمی دوانزه، نازانم چه‌ند زریان هه‌ڵگیرسا له ناخمدا تا به‌رزكه‌ره‌وه‌كه گه‌یشت، ته‌نها ئه‌وه ده‌زانم چاوه‌كانمان كه له یه‌كتردا گیر بووبوون هاواریان ده‌كرد، وه ڕۆیشت ... له‌گه‌ڵ داخستنی ده‌رگای به‌رزكه‌ره‌وه‌كه

ئەویش ڕۆیشت، بە دڵنیاییەوە لە کابوسێکدا بووم، بەم زووانە لە خەو هەڵدەستام و هیچ کام لەمانە ڕووی نەدەدا، کاتێک چاوەکانم چەند جارێک بەبێ ئیرادە کرانەوە و داخران، نە ئەو شوێنەی کە لێی بووم و نە ئەو ئازارەی هەستم پێدەکرد گۆڕابوو.

هەندێک جار ژیان بۆمبێک لە ناوەڕاستی ژیانتدا فڕێ دەدات و دواتر ڕای دەکرد و خۆی دەشاردەوە، و تۆ لەگەڵ بۆمبەکە تەنیا دەبوویت، ئەو جوڵانەی لەو ساتەدا ئەنجامی دەیت یان ڕزگارت دەکات یان دەتکوژێت، هەموو شتێک پەیوەست دەبوو لەسەر هەنگاوەکانی داهاتووت.

من تەنیا بووم لەگەڵ ئەو بۆمبەی کە لە ناوەڕاستی ژیانمدا کەوتە خوارەوە. ئایا تەقیەوە، یان هێشتا چەند چرکەیەکم ماوە؟ چاوەکانم کە بەرەو دەرگای بەرزکەرەوەکە دەڕۆیشتن وا دیار بوو ئەو چەند چرکەیەیان بەکارهێنابوو، هەر لەوێ. ئەمە هەر ئەو ماڵە نەبوو کە یەکەم جار بینیمان گوتمان تەواو ئەمە ماڵی خەونەکانمانە؟ نەمانگوت سەرەتایەکی نوێ، ماڵێکی نوێ؟ ئەی ئێستا خەونە نەفرەتیەکانمان چی لێ بەسەر هات؟ ئایا هەمووی تەنها یارییەک بوو؟ یان چارەنووس یاری لەگەڵ دەکردم؟

دیارە ژیان حەزی لە سەرسوڕمانە، بۆ تاقیکردنەوە، بۆ پێوانەکردنی توانای بەرگەگرتنمان، قووتم دا، جارێکی تر

و دووبـاره. ئەو گرێ گەورەیەی لە قورگمدا بوو تەنها لەو شوێنەدا مایەوە. نەک هەر سەرمای بەردەم دەرگاکە، بەڵکو شوێنی ئەو گرییەش لە قورگمدا هەرگیز نەگۆڕاوە.

ئـەگـەر پیاوێک بڕیاری دابـوو بـڕوات و ئـەگـەر ژنەکە دەسەڵاتی گۆڕینی بڕیارەکەی نەبووایە ئەوا هیچ شتێکی تر نەبوو کە بتوانێت بیکات بێجگە لەوەی ڕێگەی پێبدات و قبووڵی بکات، بۆیە منیش مۆڵەتم دا بڕوات، لاواز بووبووم، ماندوو بووبووم، دوێنێ شەو بۆ دواجار بەرەنگاری بوومەوە، وەڵامی ئەو؟ تەنها" ئیتر خۆشم ناوێیت" بوو، ئیتر ئیتر خۆشم ناوێت ... کەواتە خۆشویستنیش کاتی هەبوو، کەواتە بە تێپەڕبوونی کات مرۆڤەکان واز لە خۆشەویستنی ئازیزانیان دەهێنن؟

پاشان ڕستەیەک کە پێشتر چەندین جار گوتبووم گۆڕا بۆ ئەو گرێ گەورەیە؛ "من نامەوێت جیاببینەوە"، دڵنیا بووم جارێکی دیکە نایڵێمەوە، منیش بێدەنگ بووم، کردەی بێدەنگیم بەکارهێنا، کە بە یەکێک لە باشترین کارەکان دادەنرێت کە دەیکەم، دەکرێت چی لە بیدەنگی ژنێک خراپتر بێت؟

ژن کاتێک بێدەنگ دەبێت کە هیچ ئومێدێکی نییە، بێدەنگ دەبێت کاتێک قبوڵی دەکات کە چیتر ناتوانێت هیچ بگۆڕێت، بە کورتی بێدەنگ دەبێت کاتێک دۆڕاوە. منیش وەستام، هەموو خەونە ئەگەرییەکانم کوشت و تەرمەکەیم لە شوقەکەدا

ناشت و بێدەنگ بووم، کارێکم کرد کە زۆربەی ژنان ناوێرن؛ تەنیاییەکەم قبوڵ کرد، بەرپرسیارێتی تەواوی ژیانم لە ئەستۆ گرت و پێم وابوو ژیانێکی دیکە دەکرێت هەبێت، من گەنج بووم، هەرگیز لایەنی تاریکی ژیانم نەبینیبوو، هیچ سەختییەکم نە بووبوو.

وەڵامی پرسیاری "ژیان چۆنە؟" هەرگیز بۆ من " قورس" نەبووە. شێتانە دەژیاین، کارمان دەکرد، داهاتمان هەبوو و بە باشی خەرجمان دەکرد و ئێستا ژیانێکی نوێ دەستی پێکردبوو. بێگومان قبوڵکردنی ئاسان نەبوو، منیش بە ئاسانی نەمتوانی قبوڵی بکەم ئەم بارودۆخە، سەرەتا ئەو دەرگایەم داخست کە هەموو سەرمای مانگی کانوونی دووەمی دەهێنایە ژوورەوە، ئێستا لەم ماڵە گەورەیە لەگەڵ کچە بچووکەکەمدا بە تەنیا بووین، "بێرێن" تەمەنی تەنها ساڵ و نیوێک بوو دوای چەند مانگێک جارێکی تر خۆم بەرز دەنرخێنم بۆ بوێری و بەرگەگرتنم، بەڵام بۆ ئێستا هیچ ناوێک نەبوو کە بتوانم بیڵێم بەو سەرلێشێواوییە و هەست و سۆزانەی کە تێیدا بووم.

هەر لەو ساتەدا بوو کە زانیم گەورەترین وێرانکاری جگە لە لەدەستدانی کەسێک بۆ هەمیشە هیچی تر نییە، لە ژێر داروپەردوویەکی گەورەدا گیرم خواردبوو، نەمدەتوانی هەناسە بدەم، ئازار لە هەمان شوێنەوە بە جەستەمدا بە پەلە دەهات بۆ ڕۆحم، کە پارچە پارچەی کردبووم.

ئەوەی هەستم پێدەکرد هیچی تر نەبوو جگە لەوەی ڕۆحم جەستەمی لە شوێنی خۆی بەجێدەهێشت، پاشان گریان و هەنسکە یەک لە دوای یەکەکان قووڵتر دەبوونەوە، لەناو بێدەنگی ماڵەکەدا و نەما، ئەو ژنە لەوێدا لەناوچوو، لەوێ بەخاک سپێردرا.

بەهار تەنها لەوێ مایەوە، ڕۆحی لە جەستەی دەرچوو، سەرگەردان بوو، کچەکەی لە باوەشی گرت، ماچی کرد، دەستی بە قژیدا هێنا، بردییە سەر جێگاکەی، ئێستا ئەم جێگایە، ئەم ماڵە، ئەم شارە بۆ ئەو دووانە چەند گەورەیە، پاشان چووە چێشتخانە، لەسەر ئەو کورسییەی کە "ئیمرێ" چەندین کاتژمێر لەسەری دانیشتبوو پێش ئەوەی بڕوات دانیشت، کورسی دارەکە هێشتا گەرم بوو، جارێکی تر ئەو دەستەواژانەی کۆکردەوە کە لە مێشکیدا دەنگیان دەدایەوە، هەڵیدەبژارد و لەناوی دەبرد، ئەوانیش بە ئەندازەی ئەو قژانەی لە ناوەڕاستی مێزەکەدا کەوتبوونە خوارەوە ڕاستەقینە بوون، بە هەردوو دەستی دەمی بە توندی داپۆشی، وەک ئەوە وابوو هاوارەکەی لە لێوەکانی دەربچێت و چەندین کیلۆمەتر درێژ بێتەوە، خۆی توند گرت، بەڵام شکستی هێنا. هاوارێکی وەها بوو هەستی کرد دیوارەکانی دڵی لە چێشتخانە بێدەنگەکەدا دەدڕێن. دەیتوانی چی لە پیاوێک بکات تا قژی ئەوا هەڵوەریبێت؟ بە بێدەنگی

وازی لە گریان هێنا، کاتێک ڕوومەتێکی خستە سەر مێزەکە، چاوەکانی لە پەنجەرە گەورەکانی چێشتخانەکەوە سڵاویان لە یەکەم بەفری مانگی کانوونی دووەم کرد، دەنکە بەفرەکان هێواش هێواش تێکەڵ بە روناکیەکانی گالاتا دەبوون، بەڵام تاریکی ڕۆحی نەدەکرا بە هیچ سپییەک داپۆشرێت، هەموو رووناکیەکانی ناوەوەی کوژابوەنەوە.

مرۆڤ لە بنەڕەتدا تەنیا پێکدێت لە خۆی، کاتێک هەموو کەسێک لە ژیانیدا پاشەکشەی کرد بۆ ماڵەکانی خۆی، کاتێک ئەو پیاوەی کە لەگەڵیدا هاوبەشی جێگاکە بوو پشتی دەکرد لێی، دیسانەوە تەنیا و تەنیا خۆی هەبوو.

بەهار خۆی لە پشت دەرگای دەرەوە ئەژنۆکانی بە سنگیدا کێشابوو، لە سەلامەتترین بەندەر پەنای دا، خۆی بوو پەنای بۆ خۆی بردبوو، کەمێکی دیکە چاوەکانی دەکردەوە، ڕۆحی پێش ئەم شتانە ژیابوو، بۆ چەند خولەکێک ڕوومەتەکەی لەسەر مێزە ساردەکە بوو، قژی "ئیمرێ" لەناو لەپی دەستی بوو، بە بەتاڵی سەیری ئەو تاریکییەی دەکرد کە شەوەکەی داپۆشیبوو، دەنگێکی قووڵ ڕۆحی لەوێ برد، فرێیدایە ئەو شوێنەی کەسەر بەوێ بوو، بەهار چاوەکانی کردەوە، دەنگێکی نەبیستراو بە چرپە گوتی؛ بەخێر بێیت بۆ دۆزەخ!

کاتێک چاوەکانم کرانەوە هێشتا لە هەمان شوێن بووم، نەمدەزانی چۆن خەوم لێکەوتبوو لێرەدا، خەوتبووم یان نا، "بێرێن" لە باوەشی مندا بوو، خەوی لێکەوتبوو. کاتێک سەیری کردم جارێکی تر نەفرەتم لەوە کرد کە ئەزموونمان کردبوو، زۆر نەفرەتم لە "ئێمرێ" کرد بۆ ئەم دۆخەی ئێمەی خستبووە ناویەوە، بێزار بووبووم لەو وشە ناشرینانەی کە بە بێ کۆنترۆڵ فڕێم دەدا و دەترسام وەک ئەوەی "بێرێن" گوێی لە قسەکانم بێت، پاشان دیسان بێدەنگ بوومەوە، لە دڵی خۆمدا گوتم؛ بێدەنگ بە! " باشترە بێدەنگ بیت!"

وەک فریشتەیەکی جوان بوو، ڕۆڵەکەم لە باوەش گرت، بۆنەکەیم بە قووڵی هەڵمژی، پاشان جارێکی تر و جارێکی تر گریام، نەمتوانی بوەستم، تێگەیشتم کاتێک پاڵەوانی ناخی مرۆڤ دەمرێت هیچ چیرۆکێک ناتوانێت دڵنەوایی بدات.

دوای ئەوەی "بێرێن"ی خستە سەر جێگا، فیلمەکە لە وێنەگرتنی زنجیرەکاندا بەردەوام بوو. ئەو قژەی لەسەر مێزی چێشتخانەکە دۆزیبویەوە، ئەو بەفرەی کە گالاتای داپۆشیبوو، سی دی یەکان کە بەسەر قەنەفەی ژووری میواندا بڵاوبوونەوە، کاتژمێر و خولەک، یەک لە دوای یەک دەسوڕانەوە، ئەو کاتەی کە ناتوانێت نیوەشەو بدۆزێتەوە دەنگێکی پەیوەندی کە باری دەروونی ماتەمینیماڵەکەی تێکدا هات... بۆچی کەسێک هەم

دەڕوات، هەم پرسیاری ئەو کەسانە دەکات کە بەجێیهێشتووە؟ کاتێک وەڵامم دایەوە سەرەتا گۆرانییەک لێدرا دەیگوت؛ "من ماندووم ژیان"، دواتر یەکێکی تر گریا و گوتی؛ "زۆر ئازاری هەیە". بەڵێ کەسێکی تر، لەو ساتەدا هەستم بەو دڕندەییە نەدەکرد بەرامبەر بە هیچ شتێکی تر بەو ئەندازەیەی بۆ ئەو هەمبوو، لە کاتێکدا بەو شێوەیە دەگریا، چاوەکانم لەسەر ئەو کوپە بەتاڵەی سەر کەوانتەرەکە بوون، کووپەکە بەتاڵ بوو، و قسەکانی ئەویش بەهەمان شێوە ...ڕەنگە زۆر درەنگ بێت، هەرچەندە شتێک بەرجەستەی کەوت، دەزانم ئێستا ئازاری هەبوو، بەڵام ڕەنگە هەرگیز ئەم ئازارەی لەبیر نەیەتەوە کاتێک سبەی لە ڕۆژێکی نوێ لە خەو هەڵدەستێت.

### چونکە پیاوان زۆر زوو بە هەموو شتێک ڕادێن.

تا زیاتر دەمگوت؛ "وا مەکە" زیاتر دەگریا. کاتێک تەلەفۆنەکەم داخستەوە شتێک لەناخمدا گوتی وەرە دواتر شتێکی خراپ ڕوودەدات و دواتر هەست بە تاوان دەکەیت بڕۆ بیدۆزەرەوە، نەمتوانی بێباک بمێنمەوە. ئەم بیرکردنەوە چەقۆی لێدەدام تا زانیم لە کوێیە، ئاسو یاریدەدەرەکەی گوتی؛ "ئەو لە کۆمپانیایە".

لە ڕێگام بۆ ئەوێ، بیرم لە ئەزموونەکانمان دەکردەوە.

لەگەڵ چوونە ژوورەوەم بۆ دەرگای کۆمپانیاکە، لەرزەکانی ناخم بە هەموو خانەیەکمدا بڵاوبووەوە، توندتر "بێرێن"م لە باوەش گرت، بە دەستە بچووکەکانی توندتر ملی لە باوەش گرتم. بۆ ساتێک چاوم لەسەر "ئەمنی ئەحمەد" کەوت، بە ترسەوە گوتی؛ "نەمانتوانی ئارامی بکەینەوە خاتوو بەهار."

تازە پێم لە نهۆمی یەکەم دانابوو کە دەنگێک گوێمی پڕ کردەوە؛ من هەڵە بووم، ژیان لە ڕووخسارم مەدە، جێگەم دا بە شێتترینی عەشق، کەواتە بەو کەسانەی بەتەمەنمدا هاتن و ڕۆیشتن، وا مەکە ئەو سەرە تەنیایەم بچەمێتەوە، ماندوو بووین، هەڵە بووین، بە ژیانی یەکتریدا تێپەری بووین، ئێستا تەنیا مابووینەوە، لەگەڵ بەرزبوونەوەی دەنگی گۆرانییەکە، دڵم خێراتر لێیدەدا. ئەو "ئێمریێ"یەی کە بڕیار بوو بیبینم بە دڵنیاییەوە "ئیمریێ"یەک بوو کە پێشتر نەمبینیبوو، دەترسام. وەک ئەوە وابوو هەنگاوێک بەرەو پێشەوە و دوو هەنگاو بۆ دواوە بنێم.

لەبەردەم دەرگای کراوەی ئۆفیسەکە وەستابووم، پاشان بە هێمنی چوومە ژوورەوە و "بێرێن"م خستە سەر زەوی، کاتێک چوومە ناو ئۆفیسی بەڕێوەبەر...

مرۆڤێک چەند دەتوانێت لە ماوەی سێ کاتژمێردا بخواتەوە، ئەو ئەوەندەی خواردبوەیەوە، چی لەبەردەمدا بوو بوو

هەڵیدابوو...هەموو شتێک شێواو بوو، هەم ئۆفیسەکە، هەم خۆشی.

"ئیمرێ" کە منی بینی گوتی؛ "بڕۆ دەرەوە! پێم گوتیت نامەوێت بێیت!"

دەیان بیرکردنەوە کە لەو ساتەدا لە مندا کەڵەکە بوون، بەرەو گۆشەی جیاواز هەڵهاتن، جارێکی تریش بڕیار بوو دەنگەکەی بە هەمان بەرزی بێت، بەڵام "بێرێن" هاتە ژوورەوە، لەکاتی گوتنی؛ "باوکە" بزوێن دوای بزوێن، ئەو ئازارەی کە لەناو "ئیمرێ"دا گیر بووبوو، جارێکی دیکە بڵاو بووەوە. وردە وردە ڕژان، "بێرێن"ی لە باوەش گرت و پاشان لەسەر کورسییەکە دانیشت.

"ئاسو" "بێرێن"ی برد و چووە ژوورەکەی تر،" ئیمرێ" لەسەر ئەو کورسییەی کە پشتی پێوە نابوو ئەژنۆکانی بۆ سنگی ڕاکێشا و چەند خولەکێک بێدەنگ بوو، ئەو بێدەنگ بوو، من بێدەنگ بووم، پاشان دەستەواژەیەکی سست بە لێوە وشکەکانیدا خلیسکا؛

"بۆچی خۆشت نەویستم"؟ نەخێر؟ ئایا ئەو شێتە؟ چاوەڕێی چی تری لە من دەکرد؟ تا ئەو کاتەی ماڵەکەی بەجێنەهێشت شەرم نەکرد بۆی؟ ئاخر منیش مرۆڤ بووم، ئەویش هەموو شتێکی کۆتایی پێهێنابوو کاتێک پێی گوتم ئیتر خۆشم ناوێت.

ئێستا من ئەو کەسە بووم کە لە چاوی ئەودا خۆشەویستیم نەبوو؟ بەڵێ ڕەنگە هەندێک شت وەکو جاران نەبووبێت، بەڵام ئەوە بەو مانایە نەبوو کە من خۆشمناوێت، ڕەنگە ئەگەر کەمێک خۆشی بویستمایە و دڵی وای لێبکردمایە هەستی پێبکەم، جارێکی تر وەک جاران خۆشم دەویستەوە، بەڵام ڕێگای ئاسانی هەڵبژارد و ڕۆیشت. لە سەختترین کاتەکانمدا کە هەوڵم دەدا بە دایکایەتی ڕابێم، بە تەنیا جێی هێشتم. پاشان ماندوو بووین.

## ئێستا کام لە ئێمە مردووەکانی لە نێوانماندایە دەنێژێت؟

وشەکانی ئازاری نەدام، من ئەوەندە بێهێز بووم کە مرۆڤ دەتوانێت لە شەوێکدا بێهێز بێت، وەک ئەوە وابوو دڵم دەرهێنراوە و بە دەیان کیلۆ بەردیان لە جێی داناوە، ڕوون بوو کە شتێک لەناو مندا بەتاڵ ببوو و شوێنەکەی پڕ نەدەبوەوە، دڵۆپێک لەو فرمێسکانەی کە چەندین کاتژمێر دەمڕشت ئیتر لە چاوم نەدەکەوتنە خوارەوە...

بۆ ساتێک پرسیارم کرد کە ئایا دەبێت ئەمە دوا شەوی چیرۆکەکەمان بێت؟ شووشە بەتاڵەکانی ئەو ژوورە، شتە شکاوەکان، دڵە شکاوەکان، جەستەی بێدەنگ، ڕۆحی ماندوو،

بەفری داپۆشراوی شەقامەکان، "بێرێن" لە ژوورەکەدا، گریانی پیاوێکی بەهێز، ئەو گۆرانییەی کە بەردەوام دووبارە دەبوەوە...

ڕاچڵەکیم، کاتێک "ئیمریێ" بازێکی دا و قۆڵمی گرت، کلیلەکەی لەسەر مێزەکە برد و "بێرێن"ی لە باوەش گرت... گفتوگۆکانی دواتر تەڵخ بوون و دەرگای چوونە ژوورەوەی کۆمپانیاکە بەر زەبری هێز درا، دەرگای ئۆتۆمبێلەکەی قوفڵ کرد. جامی ئۆتۆمبێلە بەفر داپۆشراوەکە لەناکاو پاککرایەوە، چاوە ترساوەکانی "ئاسو" و "ئەحمەد" لەسەرمان بوون..

کاتێک ئۆتۆمبێلەکە لە شوێنی وەستانی ئۆتۆمبێلەکان هاتە دەرەوە، گڵۆپێکی سپی هەموو سەرنجی منی برد کە نووسرابوو؛ "کۆتایی". دوای ئەو ڕووداوانە چەند ڕۆژێک بێدەنگ بووم. زۆرجار سوپاسی دروستکەرم کرد کە ئەو شەوە دوا شەوی ژیانم نەبوو. من هەرگیز ئەو ڕووناکییە سپیەم لەبیرنەکرد، هەروەها دەستی ڕاستم بەردەوام دەلەرزی، هەمیشە دەمشاردەوە...

لەکاتی هەوڵدان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی کێشە گەورەکان، مرۆڤ دەیویست بە تەنیا بێت، یان کەسێک لە تەنیشتی بێت کە بتوانێت یارمەتی بدات بۆ وەستان ... من هیچم بە کەس نەدەگوت، وەک ئەوە وابوو کە ئەم شارە زەبەلاحە تەنها لە "بێرن" و من پێکهاتبێت. ئێمە وەک ئەو کەسانە بووین کە بە

تەنیا دەمانەوە تاوەکو مردن، هەر جارێک بیری لێدەکەمەوە، نەفرەت لەو ڕۆژە دەکەم کە بڕیارماندا ماڵەکەمان بگوازینەوە بۆ ئێرە، هیچ فەلسەفەیەک نەیدەتوانی ڕێگریم لێبکات بیر لەوە نەکەمەوە کە شتێک هەیە لەم ماڵەدا بۆیە ئێمە باش نین.

دەنگێک بە نزمی لەناوەوەمدا بەردەوام زیاتر لە ساڵێک بوو چرپەی دەکرد، دووبارەی کردەوە کە ئەکرێت هەڵە لەمنیشدا هەبووبێت، ئەمجارەیان بە دەنگێکی زیاتر، من بە دوودڵییەوە بەرگریم کرد، لەکاتێکدا دەمزانی کە "ئیمرێ" پێشتر دووبارە و سێبارە گوتبووی کە ڕۆژێک دەڕوات ئەگەر بەم شێوەیە بەردەوام بم، کە دەبێت ئیتر خۆم کۆبکەمەوە، کە دەبێت زیاتر گرنگی بە ماڵەکەم و هاوسەرەکەم و منداڵەکەم بدەم، بەڵام لەدڵی خۆمدا هەر بەرگریم لەخۆم دەکرد و بە دەنگەکەم دەگوت؛ تا کەی ژنێک دەکرێت قوربانی بدات بە پیاوێک کە باوکێکی باش نیە و بە پێی پێویست خۆشینەویستم و چاوەکانی نەدەدرەوشانەوە و دەنگی پێنەدەکەنی و خەمخۆر نەبوو.

تووڕە بووم کاتێک گوتی؛ دەکرا شەڕت بۆ بکردایە، گوتم؛ وازم هێنا، چونکە هەردووکمان ویستمان خۆشبویسترێین، لە کاتێکدا چاوەڕێی ئەوەم دەکرد خۆشی بوێم، ئەویش چاوەڕێی ئەوە بوو کە منیش خۆشم بوێت، ئەو موعجیزەیەش کە چاوەڕێمان دەکرد هەرگیز ڕووی نەدا. وام گووتوو گوێم لە دەنگەکەی ناوەوەم داخست.

کەواتە من ئەو کەسەم کە وازم هێنا، توانیم "ئیمرێ" لەگەڵ ژنێکی تردا بەجێبهێڵم، من گەمژە بووم کە پێم وابوو پشتگوێخستنی ڕاستییەکان دەتوانێت وامان لێبکات هەموو شتێک لەبیر بکەین. بەڵام ئەم باوەڕە هیچی نەکرد جگە لەوەی کارەساتە بچووکەکە بە هاوارەوە بێتە دەرەوە.

هەستم دەکرد کەسێک هەیە هاتۆتە ناو ژیانی "ئیمرێ"وە، بە ئاشکرا پرسیارم لە "ئێمرێ" کردبوو، بەڵام هەمیشە دەیگوت وانیە و خۆت درووستی دەکەیت، ئەوەندە ئاماژە هەبوو کە ئەگەر کۆمبکردایەتەوە بەس دەبوو بۆ ئەوەی وەڵامێکی گەورەم دەستبکەوێت، بەڵام لەبری ئەوە باوەڕم بەو بیرکردنەوە بوو کە خۆم پێکم هێنابوو، من بێهەڵوێست بووم، سیستەمێک کە لە کەسانی تردا بەو شێوەیە باش کاری نەدەکرد، بۆ من باشتر کاری دەکرد؛ هەستی شەشەم... ڕەنگە ئەمە بێت کە "ئیمرێ" نەیتوانیبێت بیبینێت لە مندا.

**کۆتایی پێدێت کاتێک هەست بە بوونی کەسەکە ناکەیت لە دڵتدا.**

**درێژکردنەوەکە پێویست نییە، ڕەنگە زیاتر لە ناپێویست ئەشکەنجە بێت.**

کاتێک بیرم هاتەوە کە سالێکە بەم ئەشکەنجەدا تێپەڕین، لە دڵی خۆمدا دانم بەوەدا نا کە بڕیارەکەی "ئێمرێ" لە ڕاستیدا کردارێکی بوێری بوو. "ئێمرێ" هەموو دۆخێکی هەڵسەنگاند کە دەکرا ئەزموونی بکەین، پێوانەی کردبوو و قورسترین بڕیاری دا و هەردووکمانی لەم ئەشکەنجە ڕزگار کرد.

لە کاتێکدا کە "ئێمرێ"م بە بەرپرسیار دەزانی لەوەی بەسەرماندا هات، لە ڕاستیدا شاردنەوەی ڕاستییەکان لە خۆم بەردەوام ئەشکەنجەمی زیاد کرد، چەند هەفتەیەکم لەم ماڵە گەورەیە کوشت... چەند هەفتەیەکی تەنیا...

## پاشان چەند کتێبێک ...

بەس نییە چەند یادەوەرییەک، دووبارە بەس نەبوو، لە کۆتاییدا ئەم شارەم کوشت و کۆتایی هات،

بەم شێوەیە ئیستەنبوڵێکی گەورە لە یادەوەرییەکانم دەسڕایەوە و دەفتەرەکەم پاک دەکرایەوە.

کاتێک چوومە کۆمپانیا بۆ کۆکردنەوەی شتەکانم، کاتێک "ئێمرێ" ئەو ڕۆژەی پەیوەندی پێوە کردم بیرمدەکردەوە کە زۆر زوو ڕادێت و هەموو شتێک لەبیر دەکات، ڕێک ئێستا بۆم دەرکەوت کە ڕاستم دەکرد، دەنگی قاقا لە ژوورەکەیەوە دەهاتە دەرەوە، ئازارەکەی کەم بووبووەوە، ڕاهاتبوو.

ئەگەر مرۆڤ بتوانێت بەو خێراییە ئەو کردارە بگرێتەبەر کە پێی دەگوترێت؛ "ڕاهاتن"، بە دڵنیاییەوە ئەم پرۆسەیە بۆ من بە هەڵە کاری دەکرد، چونکە ڕانەهاتبووم تا ئەو سانیەیەش، بە هیچ ڕانەهاتبووم، لە کاتێکدا ئەویش وەکو جاران بەردەوام بوو لە ژیان، ڕەنگە باشتر و بەختەوەرتریش لەو ساتەوەختەدا دیسان دیلی ئەو تووڕەییە بوومەوە کە لەناومدا ئاوسا بوو،

لەناکاو بەرگەی دڵخۆشی ئەوم نەگرت. تورە بووم.. هێندە تورە بووم گوێم جارێکی تر بەرگەی ئەو پێکەنینەی نەدەگرت.

ئەوەی ماوەتەوە کەمێک تەڵخە، و خاڵبەندی زۆر ... ئەو شتانەی لە سندوقەکەدا کۆکراونەتەوە، ئەو ئۆفیسەی کە دواجار سەیری کرا، سەوزی گوڵە هیواخوازەکان لە کۆتایی کۆریدۆرە سپییەکە، دوگمەی بانگی هەڵگەڕاوەی بەرزکەرەوەکە، کاتێک بەرزکەرەوەکە کە چەندین جار بەرەو سەرەوە و خوارەوە دەڕۆیشت و دەوەستا، ویستم ڕۆحی جەستەم ببات، ئەو ڕۆحەی کە جەستەمی بەجێهێشتبوو، ویستم بمبات بۆ ژیانێکی تر... ڕووی نەدا.

هیچ شتێک بەس نەبوو بۆ شاردنەوەی ئەو ئازارەی کە ئەو ڕۆژە ئەزموونم کرد، و ئەو تورەییەی کە ئەو ڕۆژە هەستم پێکرد، پڕپڕ بووم و بووم بە بەرد، لەگەڵ ئەوەشدا بۆشاییە بێماناکەم لەناخمدا گەورەتر دەبوو.

**تێگەیشتم بۆشاییەکی فراوان هەمیشە لە شوێنێکدا لەناو مرۆڤدا هەیە، وەک گەڵایەکی پاییز کە لە لقەکەی لێبوەتەوە و ئیتر هەر دەلەرزێت...**

## چ سزایەک لەوە خراپتر دەبێت
## کە لەبیر لەکرێت؟

منیش ویستم لەبیری بکەم، شیلەر دەڵێت؛ لێبوردن و لەبیرکردن تۆڵەی کەسە باشەکانە، کەواتە بەم شێوەیە تۆڵەی خۆمم دەکردەوە، سووربووم لەسەرئەوەی هەموو شتێک لەبیر بکەم، بۆ من و بۆ "بێرێن" کە هێشتا هیچ نازانێت دەبوو ژیانێکی تازە بۆ هەردووکمان دەست پێبکات، دەبوو لاپەڕەیەکی وەها پاک بکرایەتەوە کە دەبوو بە هەموو ژیانمان دڵخۆش بین.

بێگومان پێش ئەوەی ئەم بیرۆکەیە لەناومدا جێگیر بێت، چەندین جار کەوتم، هەستم دەکرد هەموو شتێکم لەدەستداوە، هاوسەرەکەم، کارەکەم، پیشەکەم، هاوڕێکانم، ئەو شارەی تێیدا دەژیم، خۆشبەختیەکانم، باوەڕم بە ڕۆژە خۆشەکانم، متمانەم، هەموو شتێکم... هەموویان تەنها یەک تاوانباریان هەبوو، "ئێمرێ" ... پاشان دەستم کرد بە تورەبوون لە خۆم، چونکە هەر من بووم ڕێگەم دا "ئێمرێ" وا لە من بکات ئەم شتانە بژیم.

**فێربووم کە مرۆڤ کاتێک بریندار دەبێت لەلایەن ئەو کەسەی کە زۆرترین متمانەی پێیەتی، لە کۆتایدا ئەوە هەر خۆیەتی کە ناتوانێت لەخۆی خۆشبێت.**

دووبـارە و سێبارە لە خۆم تـورە دەبـووم. چەندین جار ڕووبەڕووی خۆم بوومەتەوە، پاشان بڕیارمدا ڕێگای شیلەر بگرم، بۆ ئەوەی لێی خۆش بم، بەڵام سەرەتا لە خۆم...

دواجار سەیری خانووە چۆڵەکەم کرد، دەیان ڕستە لەناو مندا دروست بوون، ویستم بڵێم لێت خۆشدەبم، بەڵام نەمتوانی، لەو ساتەدا هیوام دەخواست کە بەم زووانە بەرز ببمەوە بۆ ئاسمان و لە هەموو ئەو قورساییەی سەر شانم ڕزگارم بێت...

چاوەکانم کرانەوە بۆ بەیانییەکی کەمێک خۆراوی، بۆ یەکەم جار لە جێگاکەم هەستام بەبێ ئەوەی جنێو بەو پەردانە بدەم کە هێشتا نەبەسترابوون.

چاوم کەوتە سەر سندوقەکان، هێشتا لە شوێنی سەرەتایی خۆیان بوون، دایکم ویستی چەند جارێک بێت و ڕێکیان بخات، بەڵام گەورەترین چاکە کە لە ئێستادا دەیتوانی بیکات ئەوە بوو ئاگاداری "بێزێن" بێت، چەند ڕۆژێک خەوتم بێ ئەوەی بزانم چەند ڕۆژ تێپەڕیوە بەسەر کۆچم بۆ ئیزمیر، بەڵام دواجار ئەو ئارامییەم دۆزیەوە کە دەمویست.

پرسیاری زیاتر و زیاتر لە مێشكمدا دەسوڕایەوە، ئەوەی من ئەمكرد ئایا هەڵهاتن بوو یان سەرەتایەكی نوێ؟ ترسام لە هەستەكانم، بەرپرسیارێتییەكانم، ژیانە نوێیەكەم، لە هەموو شتێكی ئەم ژیانە تازەیەم دەترسام، وەك شێت... سەرم سوڕمابوو لە خۆم، هەم هەنگاوم بە بەهێزی دەنا، هەم بە ترسەوە، لە یەك ڕۆژدا چوومە ژیانێكی نوێ و هەنگاوی پێویستم نابوو بۆ ئەوەی هەموو شتێك سەرلەنوێ دەست پێ بكەمەوە، تاكە شتێك كە سەرەڕای هەموو ترسەكانم بە زیندوویی هێشتیمییەوە، باوەڕبوونم بوو بە ڕۆژە خۆشەكانی داهاتوو. هەموو ئازارێك كە بەسەرم دەهات بەرامبەر بوو بەو باوەڕەی كە هەمبوو بەو ڕۆژە خۆشانەی كە دێن، لە كۆتاییدا دەمتوانی بەسەر هەموو شتێكدا بەو شێوەیە زاڵ ببم.

وە سەركەوتوو بووم ... ئەو ڕۆژە یەكەم شت "بێرێن"م لە دایكم وەرگرتەوە، پاشان ماڵەكەم بە هێواشی ڕێكخست، پەلەم نەبوو، بەخۆمم دەگوت با هەموو ڕۆژێك سندوقێك بكەینەوە و تێیپەڕێنم، داوام لە دایكم كرد چەند گوڵێكی گۆزەدار بهێنێت، دەمگوت بەهار دێت بۆ ئەوەی پەنجەرەكە بەتاڵ نەبێتەوە، دەستم بە كاروباری گوڵ كرد، كە پێشتر هەرگیز بە جۆش و خرۆش نەبووم بۆی.

من هەرگیز باسم نەکرد، بەڵام لەم پرۆسەیەدا چەند جارێک لەگەڵ "ئیمرێ" قسەمان کرد، ڕەنگە یەکێک بێت لەوانەی کە سەرنجی ئەو نامۆییەی لە مندا دابوو، ئەو یەکەم کەس نەبوو یەکەم؛ ئەوە دایکم بوو کە دیسان سەرنجی ئەو جووڵەیەی لە ڕۆحمدا دا. ئەو ڕاستییەم لە خۆمدا هێشتەوە کە لە خۆم خۆش بوو بووم و گوتم؛ بەهارە" . "بە هۆی بەهارەکەوەیە". هەموو مرۆڤێک وەرزێکی هەیە کە لەدایک دەبێتەوە تیایدا، هی من هاوکات بوو لەگەڵ بەهار، جارێکی تر سەوز بوومەوە، ڕوەکم کرد، گوڵم کرد، هیوام دەخواست هەرگیز پاییزێکی دیکە ئەزموون نەکەم.

ژیانمان وەک میوانخانەیەک وابوو، کە هەرگیز دەرگاکانی دانەدەخران، هاتن مانەوە و ڕۆیشتن. ڕۆیشتن و هەمیشە پێمان وابوو ئێمە ئەوانمان لە دەستداوە. بەڵام ئەوانەی توانیویانە لەو وێرانە دەربچن کە ڕۆیشتووەکان لە دوای خۆیان بەجێیانهێشتبوو، زۆر باش ئەمە دەزانن؛ باشەکان لەدەستنادرێن، لە دەست دەدرێن.

عەشق تەنها لە دڵێکدا دەتوانێت گەشە بکات

کە لە پشتی ئەو شتەوە بوەستێت کە لە هەموو

شوێنێک و لە هەموو بارودۆخێکدا هەستی

پێدەکات

ژیان دەزانێت ئازاری هەموو لەدەستدانێکت پێ لەبیر بکات...

ئایا تا ئێستا کەسێکت ئەوەندە خۆشویستووە کە پێت وابوو هەر کە ژیانت بەجێدەهێڵێت دەمریت؟ کەسێک کە پێت وابوو بەبێ ئەو ئاسمان شینێتی لەدەست دەدات، کە هەموو گۆرانییەکان مانای خۆیان لەدەست دەدەن، و هەرگیز ناتوانیت هێندەی ئەو کەست خۆشبوێت...

من دەڵێم، ئایا تا ئێستا ئەو هەڵەیەت کردووە کەسێکت خۆش بوێت کە گوڵ لە ناختدا دەچێنێت و دواتر بێ بەزەییانە ئەو گوڵانە لێدەکاتەوە؟ هەموو کەسێک لە ژیانیدا بەلایەنی کەمەوە کەسێکی هەیە ئەوەندەی خۆشدەوێت، وەکو من، منیش زۆرم خۆشویست.

زۆرم خۆشدەویست بێ ئەوەی بزانم ئەو باخچەی کە سەدان گوڵی تێدا کۆبووبووەیەوە لەناخمدا دەکرێت بە ماڵئاواییەک وشک بێتەوە، بەڵام فێربووم کە کاتێک ئەو باخچە وشک دەبێتەوە خەڵک زیاتر لە خۆیان تورە دەبن.

مرۆڤ نەیدەتوانی بە خەیاڵیدا بێت باخێک کە بە هیوا و خۆشەویستییەوە ئاو دراوە، لەلایەن کەسێکەوە تاڵان بکرێت. منیش بیرم نەدەکردەوە، زۆری نەخایاند دوای ڕۆیشتنی دڵم گۆڕا بۆ کێڵگەیەکی چۆڵ،

## ژیانی بێ گوڵ تا چەند مومکینە؟

ئیتر هیچم پێ نەمابوو، هەموو گەڵاکانم هەڵوەریبوو، منیش وەک دڵم لاواز و ناسک بووم. تەنها دەمتوانی بخەوم، بگریم و چەند ڕۆژێک لە ماڵەوە خۆم بێدەنگ بکەم، ئازاری ڕۆحم وەک هەورێکی خۆڵاوی بوو، هەموو هیواکانمی دادەپۆشی و هەرچی بەرپێیدا دەهات قوتی دەدا.

کەواتە ئەوەی دەمەوێت پێتی بڵێم ئەوەیە کە ماوەیەکی پێچوو تا قبوڵم کرد کە ئەو زەوییە چۆڵەی کە بۆ من بەجێمابوو دەرفەتێک بوو بۆ چاندنی تۆوی نوێ، و گەشەکردنی گوڵی نوێ، مرۆڤ بە ئاسانی نەیاندەتوانی واز لەو شتانە بهێنن کە ڕاهاتبوون لەسەری.

ئیتر هەموو بەیانییەک ڕوو لە چەپت ناکەیت و ناڵێیت بەیانیت باش؛ یان لەبیرت دەچێت هەموو جارێک قاپێک دادەنێیت کە ئیتر پێویست ناکات دایبنێیت لەسەر مێزەکە... بەڵام دواتر ڕاهاتی.

منیش دوای ئـەوەی لـە خـەو هەستام و دەیـان جار بە لای چەپم گوت؛ بەیانیت باش، ڕاهاتم. ڕۆژانە بە تەنیا قاوەم دەخواردەوە تا زووتر هەندێک ئازار قبوڵ بکرێت، زووتر لەو شوێنە هەڵدەستیتەوە کە کەوتوویت لێی... منیش هەستامەوە.

ئێستا کاتی ئەوە هاتبوو کە سەر لەنوێ دەست پێ بکەینەوە، کاتی ئەوە هاتبوو ئەو خاکە بێ بەرهەمەی ناو دڵم سەوز بکەم، تۆوی نوێ، هیوای نوێ، گوڵی نوێ، ژیانێکی نوێ... دیسانەوە؛ ئایا بەڕاستی ژیانێکی نوێ مومکین بوو؟ بێگومان دەکرا، ئاخر ژیان دەیزانی چۆن وات لێبکات ئازاری هەموو لەدەستدانێک لەبیر بکەیت.

"هەموو دۆڕاندنێک دەرفەتێکە بۆ دووبارە سەرکەوتن".

## دۆڕان کۆتایی نییە؛ سەرەتایەکی نوێیە...

هەندێک جار ناتوانم دەست لە هەندێک کتێب بدەم، هەست دەکەم دەست لە پارچە پارچەکانی نووسەر دەدەم لە لاپەڕەکاندا، وەک ئەوەی دەست لە برینێکی ئازاربەخش بدەم و ڕابکەم و هەمیشە لەگەڵ ئەو تاوانەدا بژیم...

ئەمڕۆ، ئەو کتێبەم تەواو کرد کە چەندین جار دەستم لێدابوو، یەک دوو ڕستەم خوێندەوە و ڕۆیشتم، تێگەیشتم بۆچی ناتوانم دەست لەو برینانە بدەم. چونکە مرۆڤەکان ئازاری خۆیان لە هەندێک کتێبدا دەبیننەوە، ئەگەر دەستی لێ بدات، پێی وایە برینەکەی کون دەبێت، دەزانی ئازاری دەبێت و وات لێدەکات هەست بکەیت ڕاکردن سەلامەتترین بەندەرەدا کە بتوانی پەنا گریت تیادا، هەستێکی وەهایە...

دۆڕان کۆتایی نییە؛ سەرەتایەکی نوێیە، و ئەمڕۆ ڕۆژێکی نوێیە... ئەو پیاوە بەم زووانە سەری لەسەر بالیفەکە دادەنێت، دەزانێت لە سەدان دڵدا بوونی هەیە، لاپەڕەیەکی تر دادەخات، ڕەنگە تەنیاییەکەی خۆش بوێت و دووبارە وەک ڕۆتینێک بنووسێت، ئێمە، لەوانەین بە هەڵگرتنی هەموو بارگرانی ژیان بەهێزتر بووین، ئێستا خەونێک بۆ خۆت درووستبکە، بۆ

باشییەکان، بۆ جوانییەکان .. بۆ هەر شتێک شایەنی ژیانکردن بێت و لەبیرت نەچێت، لەڕاستیدا هەموو دۆڕاندنێک دەرفەتێکە بۆ دووبارە سەرکەوتن.

کەسێک دەڕوات، تۆ بە ڕۆیشتنی ئەو شارێک لەدەست دەدەیت، کاتێک دەمرێت وا هەست دەکەیت هەموو شتێک لەو شارەدا مردووە، کاتێک دەمرێت، هەموو دارەکانی ئەو شارە زەرد دەبن، هەموو گوڵەکان وشک دەبنەوە. هێڵی ئاسۆ تەڵخ دەبێتەوە، هەموو ئەوانەی لەو شارەدا دەژین یەک بە یەک دەمرن، یادەوەرییەکان، شیعرەکان کە لەو شارەدا نووسراون، هەموو شتێک دەمرێت و تۆ بە تەنیا دەمێنیتەوە، ئەمە؛ ڕێگای ژیانە بۆ ئەوەی واتلێبکات دووبارە هەستیتەوە سەر قاچەکانی خۆت، لە هەموو نەبوونێکەوە لەدایک بیتەوە، ئەگەر وا نەبێت مرۆڤ ناتوانێت لەگەڵ ئەو هەموو ناخۆشییەی دڵی بژی.

“سەرلەنوێ دەستپێبکەرەوە، هەرگیز ئاسان نەبووە و هەرگیز ئاسان نابێت، کاتێک دێت، جارێکی تر هەڵدەستیتەوە، پاشان کەسانی نوێ دێنە ژیانتەوە و ئەو ڕێگایانەی کە پێشتر بە تەنیا دەڕۆیشتیت قەرەباڵغ دەبن، ژیان بەم شێوەیە پیشانت دەدات کە هێشتا دەستی گرتوویت.”

## باشەکان لەدەستنادەن،
## لەدەست دەدرێن...

دڵنیام مرۆڤ بە هەندێک ئازار ڕادێت، یان بێهەست دەبێت، چونکە دەزانێت هیچ بژاردەیەکی نییە جگە لە ڕاهاتن، بەڵام ڕاستییەک هەیە کە هەرچی ئازاری بدات، بۆ ئەوەی دووبارە نەبێتەوە بەهێزترین دیوار دروست دەکات لە چواردەووری خۆی، بیناسازی من لاوازە، من هەمیشە لە دروستکردنی دیواردا سەرکەوتوو نەبووم، یان ڕەنگە بتوانین بڵێین کە من هەموو جارێک متمانە و باوەڕم هەڵبژاردووە, مرۆڤەکان، هەستەکان، ڕووداوەکان ... بە کورتی هەڵبژاردنی باوەڕ و متمانە بە ژیان؛ لە ڕاستیدا بەو مانایەیە کە هەر لە سەرەتاوە بوێری ئەوەت هەبێت کە مەترسی دۆڕان بکەیت.

هەروەها نیشانمدایت کە ئەگەری ڕۆیشتن و وازهێنان دەبێت هەمیشە لە گیرفانتدا بێت، من نەمبوو، هەمیشە هەوڵم داوە وەک ئەوەی هیچ گەڕانەوەیەک نەبێت بۆ ئەو ڕێگایەی کە گرتم. بەڵام ئەگەر ژیان تاقیکردنەوەیەک بووایە شکستیش

هەبوو، هەرگیز نەمتوانی ئەمە قبوڵ بکەم، پێشتر هەر جارێک دۆڕابام دەبوو چەند ڕۆژێک ڕووبەڕووی خۆم ببمەوە، هەمیشە لە خۆمدا بەدوای هەڵەکەدا دەگەڕام.

قبوڵکردنم هەمیشە کاتێکی دەویست، بەم شێوەیە چەمکی لەدەستدانم لە ژیاندا ئەزموون کرد، حەقیقەتێک هەیە کە بەسەر هەموو ئەو دیوارانەدا زاڵ دەبێت کە مرۆڤ لە نائامادەترین ساتدا دروستی دەکات و لە ناوەڕاستی ژیانیدا جێگیر دەبێت؛ مردن، شتێکی وەهایە کە ناتوانیت ڕێگری بکەیت لە دووبارەنەبوونەوەی، هەندێک جار ژیانت پڕ دەبێت لە گوڵ، هەندێک جار گەڵاکان هەڵدەوەرێن، تۆش لەو پایزە دەژیت تەمەنت هەرچەند بێت, لە ژیانتا لە چەمکی لەدەستدان تێدەگەیت، بەردەوام دەبیت لە تاقیکردنەوە. هەروەها پێگەیشتم بەو ئەزموونانەی کە لەدەستم داوە، یان ئەوەی پێم وابوو لەدەستم داوە، هەریەکەیان پارچەیەکی ونبوویان لە مندا تەواو کرد و ڕۆیشت، بەم شێوەیە تێگەیشتم کە لە ڕاستیدا هەر لەدەستدانێک دۆڕان نیە.

تازە فێربووم ... شتێک لە هەر یەکەیان فێربووم، ڕەنگە هەوڵم دابێت و هەڵەبوو بووم، بەڵام هەمیشە زیاترم دەستکەوت. وە لەبەر چەند هۆکارێک ئەو کەسانەم بیر دێتەوە کە ڕۆیشتوون، هەمیشە بیر لە وتەیەکی پەیامی سەفا

دەکەمەوە و ئەو ڕستەیە هەمیشە بێدەنگییەکی قووڵ لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت؛ "مرۆڤە باشەکان لەدەست نادەن، لە دەست دەدرێن". بۆیە ئێمەش هەرگیز ئەوانمان لە دەست نەدا، ئەوان ئێمەیان لە دەست دا ...

## بێدەنگی سەلامەتترین پەناگەی مرۆڤە...

کاتێک زۆر شتت هەیە بۆ گوتن، بێدەنگ بە. چونکە بێدەنگی سەلامەتترین پەناگەی مرۆڤە، دەزانیت. کاتێک قسە دەکەیت دەترسیت گرێی قوڕگت بجوڵێت و ئازارت پێ بگات، بۆیە بێدەنگ دەبیت، ئەی باشە ئایا بێدەنگی تەنها بێدەنگییە؟ یان مرۆڤ کاتێک وادەزانێت بێدەنگە، دەمرێت؟ ئیتر خۆم لە وەرگرتنی پرسیاری دژبەیەک بەدوور دەگرم و بێدەنگ دەبم، بێدەنگ بێدەنگ دەبم، بەڵام بە هاوارەوە ... لەوانەشە مردبێتم و نەمزانیبێت، نازانم.

**نە دڵتەنگم، نە ڕۆحم ئازاری هەیە ... شتێکی لەو جۆرە، زیاتر لە جاران لە شوێنی خۆمدا بێهەستم.**

کاتێک چاوەکانم دادەخەم، ناتوانم ئەو منداڵەی لە ناخمدا هەیە بیرم بێتەوە، یەک بە یەک ئەو ڕۆژانەی کە شکاویەکانی ڕۆحم چاک دەکەمەوە دوادەخرێن... و دواتر خەیاڵ درووستدەکەم... کەنارێکی ئارام ئارام... من و تۆ "هەردوو ئاواتەکانمان هەمان شت بن بۆ ڕۆژە خۆشەکان"، مرۆڤەکان نایەن بۆ ئەوەی بمێننەوە، چونکە ئەوان دەڕۆن تەنانەت ئەگەر نەتەوێت.

"

ئەگەر هەناسەم بگرم، ئایا کات دەوەستێت؟

ناوەستێت... دەزانم، ئەم چیرۆکە کۆتایی نابێت،

وە من ... دووبارە من لەدەست دەدرێم ...

"

## کەس بە پاڵەوانی لەدایک نابێت...

یەکەم کەوتن فێرت دەکات کە جارێکی تر کەوتیتەوە ئازارەکەی ئەژنۆت چۆن دەبێت... هەموو ئازاری کەوتنەکانی داهاتوو ئاشنادەبن بۆت.

تاریکی نیعمەتێکە کە پێمان دەدرێت، بۆ شاردنەوەی ئەوەی لەناخماندایە.

## چ دڵخۆشییەکە!

ئەم بەیانییە کە لە خەو هەستام، خۆر لە پەنجەرەکەوە دەگەیشتە قژم، دیسان دەنگی چەند نەورەسێک کە لە تەنیایی ماڵەکەمدا درێژ دەبوونەوە و بێدەنگی کاتژمێرەکە کە وەستا بوو... پێڵوی چاوەکانم نەدەکرانەوە، من ناتوانم جارێکی تر ڕووبەڕووی نەبوونی تۆ ببمەوە، تاریکی جوانە، تاریکی تاکە شتە کە ئازارم نادات... لە تاریکیدا مرۆڤ ناتوانێت درک بە تەنیایی خۆی بکات.

ئایا کاتێکت هەیە کە تۆش هەست بەم شتانە دەکەیت؟ دەزانیت کاتێک ناتوانیت لەبیری بکەیت، هەرچەندە ڕوو لە ڕاستت یان چەپت بکەیت ناتەوێت لە خەو هەستیت بەهۆی ئەمەوە... دان بەوەدا دەنێم منیش ئەوەم بەسەر هاتووە.

لەو ساتەدا، دەکەومە ناو گێژەڵوکەیەکەوە، هەموو شتێک کە بە دەوری مندا دەسوڕێتەوە شتێکی زیادەیە، بەڵام هێشتا ناتوانم خۆم بپارێزم لەوەی هەموو جارێک لەو بایە دا گیر بخۆم.

پاشان ڕووناکی ... تاکە شتێک کە دەتوانێت بە بێبەزەییانە ڕاستییەکان لە ڕووخسارت بدات ... ڕەنگە هەر بۆیە هەمووومان پێویستمان بە ڕووناکی بێت، پێی ڕووتم لەگەڵ زەوییە ساردەکەدا تێکەڵ دەبن. دوای چەند هەنگاوێک خۆم تەسلیم بە سیحری ئاسمانی شین و قووڵ دەکەم، دەڵێم؛ "شارێک تەنها دەتوانێت بەم شێوەیە جوان بێت" ئاسۆکان وەک هێڵێک لە دوورەوە ... چەند بەلەمێکی کەشتیوانی و تەنیایی شارەکە لەسەر شەقامەکان بڵاوبوونەتەوە "چ دڵخۆشییەکە" بە خۆم دەڵێم؛ "تەنیایی تەنها لە چیرۆکی مندا نەنووسراوە" چ دڵخۆشییەکە...

**سەرەتا پێت وایە لەبیرت کردووە، بەڵام بە دڵنیاییەوە ئەو گۆرانییە لێدەدرێت و تێدەگەیت کە خۆت فریو دەدەیت، چونکە مرۆڤەکان هەرگیز ماڵی خۆیان لەبیر ناچێتەوە.**

وەرز هەیە کە هەست و سۆز لەگەڵیدا دەگونجێت، بۆ نموونە عەشق زیاتر لەگەڵ بەهار دەگونجێت و جیابوونەوەش لەگەڵ زستان دەگونجێت، هەندێک ماڵئاوایی مەرج نییە لە زستاندا ئەزموون بکرێت، هەندێ کات چەند وشەیەک بە یەکجار زستانی ڕەش دەهێنێت، سەرمات دەبێت، دەلەرزیت، هەست دەکەیت هەموو زستانی جیهان تەنها جەستەت دەگرێتەوە. لە ڕاستیدا ئەمانە بە هۆی هاتنی زستانەوە نییە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کاتی ئەوە هاتووە لە دڵی کەسێک بگوازیتەوە کە وەک ماڵەکەت قبوڵتکردبوو.

بەڵام خەڵک زیاتر لە ماڵئاوایی دەترسن، تەنانەت مەترسی ئەوە دەکات کە بۆ چەندین سەدە مەحکوم بێت بە بێدەنگی، بۆ ئەوەی گوێی لە وشەی جیابوونەوە نەبێت، بەڵام نازانێت هەرکەس بڕیاری خۆی دابێت بڕوات درەنگ یان زوو هەر دەڕوات، کاتی ئەوە هاتووە کەلوپەلەکانت کۆبکەیتەوە، مرۆڤ چۆن دەتوانێت لە دڵی ئەو کەسەوە بگوازێتەوە کە زۆر خۆشی دەوێت؟ کام یادەوەری لە کام سندوقدا جێبکاتەوە؟ یان شوێنێک

هەیە بۆ هەڵگرتنی یادەوەرییەکان؟

تۆ بە دەیان پرسیارەوە کە لە مێشکتدا دەسوڕێنەوە واقیعی جیابوونەوە لە باوەش دەگریت، دەزانی ساڵانێک لە یەک شار ژیان و ناچاربوون بەوەی ڕۆژێک بڕۆیت ئازارێکی ناخ هەژێن و هەستێکی لەو جۆرە بە جەستەتدا بڵاودەبێتەوە... دەڕۆیت لەگەڵ جانتا پر لە یادەوەرییەکانت... هەوڵدەدەیت لەبیری بکەیت.

ئاسانە لەبیرکردنی کەسێک کە دڵییت وەک ماڵی خۆت قبووڵکردبوو؟ هەرکەسێک ڕۆیشتوویەکی هەبێت دەزانێت ئاسان نییە، ئاسان نیە کەسێک لەبیر بکەیت کە بۆنی خۆییت لەسەرت بەجێهێشتبێت، بایەک دەهەژێت، گۆرانییەکت گوێ لێدەبێت، لەناکاو دەکەوێتەوە مێشکت، ناتوانیت لەبیری بکەیت،

منیش لەبیرم نەکرد، نە شارەکە و نە شەقامەکان، نەتوانیم لە دڵیدا بگوازمەوە ... سەرەڕای ئەوەی کەسێکم زوو شت لەبیر دەکەم، یەکسەر ئەو ئازارانەی کە ناتوانم دڵمی لێ بپارێزم لەسەر ڕەفەی کتێبخانەکەم بەناوی "لەبیری بکە" دادەنێم.

لەم ڕۆژانەدا زۆر دەترسم گۆرانییەک لێبدەم و نەیەتە خەیاڵم ئیتر، چونکە لەبیرکردن وەک ئەوە وایە بێ ڕابردوو بیت، وەک ئەوە وایە هەموو هەستێک لەدەست بدەیت، وەک بێهەستی... قورس و ترسناک...

لەگەڵ پێگەیشتنی مرۆڤدا، تێدەگات کە چەندە بە هەڵە لە کردەی لەبیرکردن تێگەیشتووە، دواتر تۆش تێبینی دەکەیت، سەرەتا پێت وایە لەبیرت کردووە، بەڵام بە دڵنیاییەوە ئەو گۆرانییەت گوێ لێدەبێت کە یادگاری هەردووکتانی تێدایە، و تێدەگەیت کە خۆت فریو دەدەیت، چونکە مرۆڤەکان هەرگیز ماڵی خۆیان لەبیر ناکەن.

## خەونەکان لە هەورەکاندا هەڵگیراون...

کاتێک بچووک بووم، پێم وابوو هەورەکان دوور دەڕۆن، وەک ئەوە وابوو شارەکەم بەجێ بهێڵن و مەودای دوور ببڕن و بچنە شارەکانی تر، زۆرم پێ خۆش دەبوو، جاران هەموو جۆرە خەونێکم پێیان دەدا، بۆ ئەوەی دوور بیانبات، وا خۆزگەم دەخواست کە کەسانی تریش ئەو شکڵانە ببینن کە من وەسفی دەکەم و هاوبەش بن لە خەونەکانمدا.

لەو کاتەدا نەمدەزانی ژیان جێگیر نیە، ئێمە دێین و دەڕۆین، کات تێپەڕیوە، خەونەکانم هیچی نەگەیشتن بە کەسانی تر، نە هەورەکان بەردەوام بوون لە هەڵگرتن، وە نە لە گواستنەوەی خەونەکانم وەستان ... و خەونەکانم هەر لەشوێنی خۆی لە بەرزیدا مانەوە.

کاتی ویست تا تێگەیشتم کە هەورەکان نەوەستاون و خەریکە گەشە دەکەم، مرۆڤ کاتێک گەورە دەبێت، ئەو یارییە بچووکانە لەبیر دەکات کە وایکرد منداڵیی مانادار بێت، ئەگەر

لەبیرم نەکردبایە، ڕەنگە ئەمڕۆ سەیری هەمان هەورمان بکردایە کە خەونەکانمانی دەگواستەوە، بەڵام سەیرکردنی هەورەکانم لەبیرکردووە، خۆم لەو بارستە خۆڵەمێشییەدا پێچایەوە کە پێی دەگوترا خەم. ئیتر شینەکان هەمیشە دوورن، هەر بۆیە وا دەردەکەوم کە لە هەر ساتێکدا باران دەبارێت، لە کاتی خۆیدا تێگەیشتم بۆ ئاشتی شین پێویستە!

جارێکی تر فێری ئومێد و هیوا دەبمەوە، هەروەها فێردەبم کە چۆن هیوا باشە بۆ باڵەکانم، کە بەهۆی باوە بریندار بوون، تۆش فێردەبیت هیچ شکاوییەکی دڵت کە ئەزموونی دەکەیت دڵت وا نامێنێتەوە، تێدەپەڕێت، ئەو برینەی کە ئازارێکی زۆری لە دڵتدا بەجێهێشتووە چاک دەبێتەوە، پاشان فێردەبیت جارێکی تر خەونەکانت بە هەورەکان بار بکەیتەوە، ڕەنگە ئەو خەونەی کە هەتە بخرێتە دڵی کەسێکەوە و ئەو دڵەش بۆت باش بێت و جارێکی تر عاشق ببیتەوە.

پێشتر دەیانگوت؛ پەنجەرەی شین هیوایە،

ئێمە بۆیەمان کرد.

## ئومێد جوانترین وشەیە...

هەمیشە، هەرکات پەنجەرەی شین دەبینم بیر لە هەمان شت دەکەمەوە، وا دیارە ئەو کەسانەی لەو ماڵەدا دەژین هەمیشە هیواکانیان لە پشت ئەو ڕەنگە شینانەوە دەشارنەوە، وەک ئەوە وایە خەونێکیان هەبووبێت و هەرگیز نەهاتبێتە دی، بەڵام لە ئومێد کردن وازیان نەهێناوە.

پاشان بەم خەیاڵانە پێدەکەنم کە لە مێشکمدا دروستم کـردووە، چونکە هەمیشە ئـەو وێنـەی خـێزانە دڵخۆشەم بیردەخاتەوە کە وەک بڵێیت وێنەی چەند منداڵێک کە لەگەڵ دایک و باوکیان لە یەک جێگادا هاوبەشن و زەردەخەنەیەکی گەورە لەسەر دەموچاویان هەیە...

ئـەوان منداڵی هـەژارن، بەڵام تەنانەت لە نیوە ڕووتیشدا دەتوانن بە ئارامی بخەون و پڕ لە ئومێدن، ئەو منداڵانەی کە تەنها یـەک یارییان هەیە بۆ یـاریکردن، بـەڵام هەرگیز

زەردەخەنەکانیان کاڵ نابێتەوە... ئەو تاکە یارییەی کە هەیانە و ئەو دەیان ئیمکانیەت و نائارامیەی ئێمە هەمانە هەمیشە دەگۆڕێت بۆ گەورەترین پرسیار، ئایا دەکرێت ئەو هیوا کەمیەی لە ئێمەدا هەیە چەندین جار لە ئێمە زیاتر بەو مندالآنە درابێت؟

ناکرێت ڕاست بێت وایە؟ بەڵێ ناکرێت. کەواتە ئێمە کەی شینییەکەمان لەدەستدا؟ بۆچی زیاتر حەزمان لە ڕەشە لە کاتێکدا هەمیشە لە جوانترین چیرۆکەکاندا شین هەیە؟

چەند جوان بوو خەون درووستکردن لە منداڵیدا، کاتێک کەش و هەوا کەمێک سارد بوو، لەناو تەمەکەدا کە نیوەی پەنجەرەکەی داپۆشیبوو، بە نهێنیترین گەشتەکانماندا ڕۆیشتین، ئەو شێوانەی لە پەنجەرەکەدا دەردەکەوون وای لێکردین لەبیرمان بچێت کە سەری پەنجەکانمان سارد بوون، هەمیشە پرسیارم دەکرد کە کێشراوەکانی پەنجەرەکە لە دەرەوە چۆن دەردەکەوتن، ئایا هەمان شتە لەگەڵ ئەوەی کە ویستم بیگێڕمەوە، یان ئەوەندەی توانیم بیگێڕمەوە؟

دوای ماوەیەک وازم لە کوشتنی خەونەکانم هێنا لەناو تەمی پەنجەرەکەدا، دەبوو ڕێگەیەکی دیکە هەبێت بۆ کەشتییە پر لە خەونەکانم، بەم شێوەیە نووسینم دۆزییەوە... ویستم قسەکانم بگاتە دڵی هەزاران کەس، بۆ ئەوەی لە شوێنێک لەوێ هێلانەیەک بگرێت.

کات تێپەڕی، ڕەنگە لە کردەی گەورەبووندا تووشی هەموو جۆرە ئازارێک بووبێتین، ڕەنگە هەندێکمان زۆر شکابێتین، بەڵام شتێک هەیە کە هەمیشە ناخمان بەردەوام بووە لە ڕواندنەوەی باوەڕمان بە ڕۆژە خۆشەکانی داهاتوو هەرگیز تەواو نەبووە.

ئاخر ئایا ئومێد جوانترین وشەی ژیان نەبووە کە تا ئێستا پێمان بەخشراوە؟

## گوێت لە ئاوازێک دەبێت...

سالآن تێپەڕی، ڕۆحی بچووکت زۆر گەشەی کردووە، وانییە؟ یادەوەرییەکانیش بە پێی کات کۆن بوون، هەروەک چۆن هەموو شتێک لەگەڵ کاتدا کۆن دەبێت... هەندێک جار گوێت لە ئاوازێک دەبێت کە بەدرێژایی سالآن کۆن نەبووە، یەک بە یەک یادەوەرییەکانی منداڵیت کە بیرت ناچێتەوە لە کوێیە لە نێو گەلآکانی یاداشتنامەکەدا جێگەی خۆیان لە مێشکتدا دەگرنەوە، سەرەتا ئەو فەرشانەی کە هەوڵت دەدا لەسەری فێری ڕۆیشتن بیت، دڵخۆشی دایک و باوکت بەو وشانەی کە هەوڵت دەدا بیڵێیت، پاشان دڵخۆشی هەبوونی خوشک و برای یەکەم کە هێشتا تێناگەیت مانای چییە...

تۆ لە سەرەتای ژیانێکدایت کە سالآن بێ ماندووبوون ئەزموونی جیاواز لەبەردەمتدا ئاشکرا دەکەن، هەموو شتێک چەندە بێتاوان و شیرینە ئەو کاتانە...

ئەو کاتانە دێت کە ناتوانیت چێژ لەو یارییانە وەربگریتەوە کە لەگەڵ هاوڕێکانتدا لەو باخچە بچووکەی بەردەم ماڵەکەتاندا ئەنجامتان دەدا، باڵات گەشە دەکات، ئەو یارییانەی کە ئەنجامی دەدەیت دەگۆڕێت.

ئێستا گەورە بوویت، کاتی ئەوە هاتووە هەموو یادگارییە بەنرخەکانی منداڵی لەناو سندوقێکدا کۆبکەینەوە، سەیر نییە؟ هەندێکمان زۆر خێرا گەورە بووین، هەندێکمان هەمیشە منداڵەکەی ناو ناخمان لە شوێنێکدا هێشتۆتەوە، هەر کاتێک ویستمان منداڵ بینەوە ئەو منداڵە نادیارەی ناو ناخمان هەمیشە یاری لە دەوری ئێمە دەکرد.

لە ڕاستیدا تۆش دەزانیت ئەو منداڵە بچووکەی لە ناختدا خۆی حەشارداوە، هەرگیز گەورە نەبووە، ئەوەی پێت وایە تێپەڕیوە لەڕاستیدا هەرگیز تێنپەڕیوە.

**ئەوەی پێتوایە تێپەریوە**
**لە ڕاستیدا تێنەپەریوە...**

کات چەند خێرا دەڕوات؛ هەر کاتێک هەموو شتێک کە خەریکە لەبیرت بچێتەوە، ئیتر دەکرێت بخرێتە سەر ڕەفە تۆزاویەکانی مێشکت، بایەکی لەناکاو پارچەیەک لە منداڵیت وەک

گەڵا وشکەکان دەبات و دەیخاتە سەر پەنجەرەکە، تێدەگەیت کە ئەو منداڵە بچووکەی لەناوەوە خۆی حەشارداوە هەرگیز گەورە نەبووە، ئەوەی پێت وابوو تێپەڕیوە هەرگیز تێپەڕیوە.

پاشان بیریدەکەیت، وەک چۆن ئەو هەناسە قووڵەی دەیگریت لە دوورترین گۆشەکانی سییەکانتدا جێگیر دەبێت، بە نەرمی بۆنی ڕابردوو هەڵدەمژیت، ڕەنگە بیری ئەو ماگنۆلیایانە بکەیت کە گوڵیان دەکرد، ڕەنگە ئەو تامە قاوە ساردانەی لەسەر دەمت بەجێماوە، یان ڕەنگە بیری ئەو ساتەوەختە لەبیرنەکراوانە بکەیت کە ساڵانێک بەسەرت بردووە و لە شەقامە بۆنخۆشەکانی شارێکدا کە لەناکاو جێت هێشتووە.

پاشان ڕۆژێک، بانگێک بۆ ڕابردوو، ئەو بەیانییە زەردەت پڕ دەکات کە چاوەکانت دەکەیتەوە، پێدەچێت بە هەموو حەسرەتەوە ئەو شارە بچووکە لە باوەش بگریت، جارێکی تر لە کۆڵانەکانیدا منداڵ بیتەوە و ساڵانێکی تریش بە منداڵی بمێنیتەوە... بانگێک بۆ ئەوەی هەموو ئەو شتانەی ژیاوویت و نەژیاوویت لە باوەش بگریت.

هەندێک جار شارێک بانگهێشتت دەکات بۆ گەشتی ژیانت، تۆ دەزانیت؛ ئەو بانگەوازە بانگهێشتێکە بۆ بەئاگابوونەوەیەکی نوێ، تۆ بە هیواوە لە هێڵێکی تەنکدا بەرەو پێشەوە دەڕۆیت، کە بەرەو حەسرەتەکانت، تەواونەبوونەکانت، پەشیمانیەکانت

درێژ دەبێتەوە. تەنها دەتوانیت پێشبینی بکەیت لەوێ چی چاوەڕێت دەکات، ڕەنگە شتەکان زۆر جیاواز بن لەوەی بیری لێدەکەیتەوە، لەوانەیە چیرۆکێکی جیاواز لەوێ چاوەڕێت بکات، بەهەر حاڵ، ئایا شایەنی هەوڵدان نییە؟

"
مرۆڤ دەبێت بەهای ئازیزانی بزانێت
تا کات هەیە
"

## پایز...

پێشتر بیرم لەوە نەدەکردەوە کە ژیانی منیش مانگی ئیلولی هەبێت، ئەم باسکردنی پایزانەم پێت وایە لەبەر ئەوە بێت منیش دەستم کردووە بەوەی وەکو گەڵاکانی پایز بکەوم؟ یان لەبەر خۆشەویستی منە بۆ پایز؟ ئەگەر بڵێی جیاوازییەکەی چییە؟ ڕاستییەکەی هەردووکیان بۆ من یەک شتن، درەختێکم کە هیچ هێزێک نیە بۆ کردنەوەی گەڵاکانی ماندوو، ڕووت، بێدەنگ ... ئازیزم مانگ گرنگ نییە، نەبوونی تۆ

### گەورەترین پاییزە لە ژیانمدا.

ئەگەر بەرگەی زستان بگریت، پاییزت خۆشدەوێت، کەواتە ئەم ئازارەی گیانم لەبەر ئەوەیە دەتوانم بەرگەی زستان بگرم؟ دووبارە لێم تێک دەچێت، یان لەبەر ئەوەیە تۆ تێکەڵ بە ناخم دەبیت، کێ دەزانێت؟

هەر جارێک بیرت لێدەکەمەوە، لە هەمان مەتەڵدا ون دەبم؛ ئایا منم لێم تێکەڵ بووە یان تۆیت لەگەڵ ڕۆحی من تێکەڵبوویت؟ بەهەر حاڵ، وەڵامەکەی نادۆزمەوە، چەندین جار پرسیارم کردووە. پاشان کە بێزار دەبم لە پرسیارکردن لە خۆم، جارێکی تر هاوار دەکەم بۆ نەورەسەکان.

"کاتێک یەک پایز بەسە بۆ ئێمە، کۆتا بەهار بۆچی خراپە بۆ نەورەسەکان؟ وا باشترە بفڕیت بۆ شوێنە گەرمەکان و ئەم چیرۆکە بە تەنیا جێبهێڵین..."

## چونکە تۆ هاتیت...

لەو کاتەوەی تۆ ڕۆیشتیت، نەمتوانیوە ڕستەی درێژ دروست بکەم. زیاتر سێ خاڵم خۆشدەوێت، هەرکات دەکەوێتە لای چەپم، چەند سێ خاڵێکی تر بۆ ڕستە تەواونەکراوەکانم زیاد دەکەم، وە دواتر جارێکی تر تۆ و بێ تۆیم خۆشم دەوێت، پاشان قسەکانم سارد دەبنەوە، ترپەی دڵم لە خۆیدا دەگۆڕێت بۆ میلۆدییەکی خاو، نەبوونی تۆ لە باوەش دەگرم....

## نەبوونیت، تەنیاییەکی بێ کۆتا...

دەڵێن؛ بێدەنگی لەبەر دەکرێت لە تەنیاییدا ... کاتێک قەرەباڵغی دەوروبەرت وورردە وورردە کەم دەبنەوە، ئاشنا دەبیت بەو تەنیاییەی کە پێشتر گوێچکەکان تووشی نەبوون، لەم ڕۆژانەدا لەگەڵ هەستێکی نوێدا ئاشنا دەبم، هەوڵ دەدەم ڕابێم، بەڵام هێشتا شتگەلێک هەن کە ناتوانم قبوڵیان بکەم، بۆ نموونە؛ هێشتا قبوڵم نەکردووە کە تۆ تەنها چیرۆکێکیت کە بە ناخۆشی کۆتایی هاتووە، مرۆڤ ناتوانێت کۆتایی چیرۆکێک

بێت کە بە؛ جارێکیان هەبوو نەبوو، دەست پێدەکات، بە عەقڵی هۆشیارەوە بڵێت؛ منیش هەرگیز نەمتوانیوە بڵێم.

بێدەنگیی ئەو شەوەی کە گوێم پڕ دەکات و بۆنەکانی یاسەمین لە بەهاردا... کەفی قاوە شیرینەکراوەکەم لەسەر دەمم... کاتێک ناوت دەست لە یادەوەریم دەدات، بیرم دەکەوێتەوە کە چەند درەنگ کەوتووین بۆ یەکتر.

ئێمە وەک خاڵێکین گرنگ نییە لە کۆتایی چ ڕستەیەک دابنرێت، هێشتا مانا نابەخشێت، دڵم بە ئاوازەوە دەڕێژم، وەک دڵۆپە بارانێک کە تازە شارەکەمانی تەڕ کردووە، لە سەربانەکانەوە، دەنگی دڵۆپەکان بێدەنگی شەقام دەشکێنن و فرمێسکەکانم کە بە برژانگمدا تک تک دێنە خوارەوە ... ڕەنگە ئێستا بایەک بهەژێت، بۆنەکەت دڵم بگرێتەوە و هەمیشە لە قووڵایی ناخمدا بتشارمەوە.

پاشان گەڵایەک لە لایەکی دڵت دەنیشێتەوە، دەبینیت؛ پاییز هاتووە، نە تاقەت لە گەڵاکاندا ماوە بۆ ئەوەی جارێکی تر لە بادا بگیرێت، و نە دڵت چارەسەری هەیە بۆ بەڕێکردنی ئەو..

## گەڵاکانی ناو پەڕەکان...

لە هەمووی زیاتر حەزم لەوەیە ئەو گەڵایانە کۆبکەمەوە کە وشک بوون و لە لقەکانیان لێبوونەتەوە، چونکە بەراوردیان دەکەم بە خۆم، کەمێک دڵتەنگیم لە هەریەکەیاندا دەبینمەوە، پاشان بە وریاییەوە دەیانخەمە نێو کتێبە دڵخوازەکانمەوە، هەرکاتێک جوانترین ڕستەی ئەو کتێبانە دەخوێنمەوە، لە نێوان لاپەڕەکاندا خۆم دەدۆزمەوە... ئەگەر وەرزەکە خەزان بێت و ئەو گەڵایانەی لەناو بادا دەمرن کە لە ژێر دارەکاندا کۆبونەتەوە، بارانێک لە چاوەکانمەوە دەست پێدەکات تا ڕوومەتەکانم، من خەمی ئەو جەستەیەمە کە لە ڕۆحم دەرکراوە، لە زەوییەکەوە هەڵیدەگرم و لە نێو کتێبەکانمدا دەینێژم...

**نەک لەبەر ئـەوەی شتێک ڕوودەدات، بەڵکو لەبەرئەوەیە هیچ ڕوونادات...**

هەندێک جار خۆم دەبینمەوە کە لە تاریکییەکی گەورەدا پیاسە دەکـەم، هەست دەکـەم چاوەکانم داخستووە و یاری چـاوشـارکێ دەکــەم، هەمیشە بێهەستی لـەسـەر سـەری

پەنجەكانمدا هەیە... دەترسم ئازیزم، من دەترسم، دەست درێژ بكەم و نەتوانم دەستت لێبدەم، قسە بكەم و نەتوانی بیبیستیت، لە نەبوونی تۆ دەترسم.

دواتر دەمەوێت ئەو شتەی لەسەر چاوەكانمم دانابوو لای ببەم، بەڵام تاریكە، دیسانەوە تاریكە، لەوە زیاتر نا. پاشان تێدەگەم، كەسێك ڕوناكییەكانی كوژاندۆتەوە، ئێمە مەحكوم بووین بە تاریكی، بەڵام خۆ ئێمە مرۆڤی باش بووین، تاوانی ئێمە چی بوو؟ هەرگیز نەمزانی ئازیزم...

ئەها چەند ساتێك هەیە لە مرۆڤدا كە هەست بە بەتاڵی دەكات، بێ ئەوەی بیر لە هیچ بكاتەوە، منیش ئێستا ئەو هەستەم هەیە، هەرچەندە نەبوونی بیرۆكە لەگەڵ من ناگونجێت، بەڵام هەندێك جار دەمەوێت بوەستم، ئارام بم. منیش ئەو ڕووناكیانە دەكوژێنمەوە، دەزانم گۆشەیەك بۆ خۆم دروست دەكەم، تا ڕابكەم و خۆم بشارمەوە تیایدا، بۆ ئەوەی ڕەنگە ئەوەی لە مێشكمدا هەیە بیشارمەوە، بیركردنەوەكانم دەشارمەوە، بۆ ئەوەی كەس نەتوانێت بیانخوێنێتەوە.

نەك لەبەر ئەوەی شتێك ڕوودەدات، بەڵكو لەبەر ئەوەی هیچ ڕوونادات ... ناتوانیت هەندێك بیركردنەوە بكوژیت، چونكە تەنها دەیانشاریتەوە، منیش لە تاریكیدا خۆم دەشارمەوە ئازیزم. ڕەنگە ڕۆژێك لەو تاریكییەدا، چاوەڕێی سەری پەنجەكانت بم،

دەست لە دڵم بدات و هەموو ترسەکانم نەمێنن.

ڕاهاتن و لەبیرکردن یەک شت نین، هەموو مرۆڤێک بە شتێک ڕادێت، بەڵام بە ئاسانی ناتوانێت لەبیری بکات، چونکە دووری یادگارییەکان ناکوژێت

## ئایا مەوداکان دەتوانێت یادەوەرییەکان بکوژێت؟

دەکرێت مرۆڤەکان لە شارەکانەوە بگوازنەوە، لە یەکترەوە، بەڵام لە یادەوەرییەکانەوە نا. ئایا مەوداکان دەتوانێت یادەوەرییەکان بکوژێت؟

هەموو جیابوونەوەیەک پرۆسەیەکی پڕ لە ئازار بەجێدەهێڵێت، دەتەوێت چەند ڕۆژێک بخەویت و ئەو دوا ساتانە لەبیر بکەیت کە لە قورگتدا گیر بووە، باوەڕ بە خۆت دەهێنیت کە تێدەپەڕێت کاتێک دەخەویت، بەڵام کاتێک چاوەکانت بەڕووی جیهانی ڕاستەقینەدا دەکرێنەوە، ئاواتەخوازیت هەموو شتێک تێپەڕیبێت، بەڵام تێناپەڕێت، ئەو شتانەی بە ژیانتدا تێدەپەڕن هەرگیز ناگەڕێنەوە، دەزانیت ئەو دەڕوات و بۆ ماوەیەک وەک کتێبەکانی ناو جانتاکەت بۆ هەر شوێنێک بچیت هەڵیدەگریت، بۆ هەر کوێ بڕوات، هەر کارێک بکات، ئەو لەگەڵتە، چونکە ناتوانیت لەبیری بکەیت.

بۆ ماوەیەکی زۆر درێژ لەگەڵ خۆم هەڵمگرت، ڕاستتر بڵێین لەناخمدا بێت باشترە، لە هەموو شوێنێک کە دەڕۆیشتم لەگەڵمدا دەهات، لە هەموو کارێکمدا، لە هەموو فیلمێکدا کە سەیرم دەکرد، لە هەموو گۆرانییەکدا کە گوێم لێدەگرت، لە هەموو بابەتێکدا کە دەمنووسی لەگەڵمدا بوو... مرۆڤ چەند دووریش بڕوات، ناتوانێت لە یادەوەرییەکان ڕزگاری بێت، منیش نەمتوانی دەرباز بم، گۆرانییەک لێدرا، من دووبارە ئەوم بیرکەوتەوە، نازانم چەند ڕۆژم بەم شێوەیە لەگەڵی بەسەر برد، بە تێپەڕبوونی کات تێگەیشتم کە بۆشاییەک لە ناخمدا لە گەشەکردندایە، هەرگیز بیرم لەوە نەدەکردەوە کە ئەو کردارە حەوت پیتەی کە پێی دەگوترێت ڕاهاتن خۆی بە بۆشاییەکی لەو شێوەیە بخاتەڕوو.

لە کۆتایی شانۆگەرییەکەدا گوترا؛ ئەم شانۆگەرییە لێرە کۆتایی هات، لەگەڵ هەوای ئەکتەرێک کە سڵاوی لە بینەران دەکرد، هەر لەو ساتەی سەرم سووڕما بوو، دوای ئەو قسەیە گوتی؛ "ئەگەر هەست بە بۆشایی بکەیت لە ناختدا، واتە خەریکە ڕادێیت". پاشان منیش ڕاهاتم، ڕاهاتن و لەبیرکردن یەک شت نین، مرۆڤ بە هەموو شتێک ڕادێت، بەڵام ناتوانێت ئەوەندە ئاسان لەبیری بکات، چونکە دووری بیرەوەرییەکان ناکوژێت، وەرزەکان دەگۆڕدرێن، ساڵان تێدەپەڕن، ڕەنگە شارەکان،

ژیانەکان تێپەڕن، بەڵام یادەوەرییەکان هەمیشە لەو شوێنە دەژین کە سەر بە وێیە، چونکە دڵ دەزانێت چۆن بیانپارێزێت.

## ناگریم...

چەند جار پێیان گوتوین؛" ئای با کەس نەتبینێت کە دەگریت"، تا وا بیربکەنەوە کە بەهێزیت، پاشان فێری بیانوو هێنانەوە بووین، نە بیانووی پیاز، نە تۆز ماوەتەوە... چۆن مرۆڤ نەدەگریا لە کاتێکدا دنیا بەم شێوەیە بوو!

گریان شتێک نییە شەرمی لێ بکرێت، دەگریت، هەندێک جار ئازاری ئەژنۆ کەوتووەکانت دەدەیت، بەداخەوە ئەمە تەنها شتێک نییە بۆ منداڵان، دەکەویت، هەڵدەستیتەوە، جارێکی تر بەرێدەکەویت و جانتاکەت پڕ دەکەیتەوە لە ئەزموونی نوێ. ڕەنگە ڕێگاکە درێژ بێتەوە، هەندێک جار زیاد دەبێت و هەندێک جار کەم دەبێتەوە. لە هەندێک وێستگەدا کەسێک لەگەڵت دەبێت لە گەشتەکەتدا، پاشان کە کاتی هات ماڵئاواییان لێ دەکەیت، هەندێک جار پێدەکەنیت، هەندێک جار دەگریت، هەمووی ئەزموون دەکەیت، ئەگەر بتەوێت بگریت دەگریت، ئەگەر بتەوێت پێبکەنیت پێدەکەنیت، ئاخر تۆ مرۆڤیت، کێ چی دەڵێت گرنگ نیە، هەمیشە خۆت دەبیت.

مرۆڤ لە هەرچیدا سەرکەوتوو بێت بە دڵ بەدەستیهێناوە، دونیا شەڕی بەهێز و لاواز نییە، هەستەکان لەوێدان بۆ ئەوەی ئەزموون بکرێن، ئەگەر تۆ نەژیت، ئەگەر من نەژیم، کێ دەژی؟ بێگومان ئەزموونمان دەبێت باش بێت یان خراپ ... ژیان بە جۆرێک لە جۆرەکان هەر دەژین.

داهاتوو مەتەڵێکی گەورەیە، تۆ ئەمڕۆ لە بەردەم دەرگای ئەو داهاتووەدایت، لەوانەیە بەیانی هەنگاو بنێیت بۆ ئەو ژیانەی دەتەوێت بژیت، هەرچەندە شکابێتیت یان چەند ئازارت چێشتبێت کاتێک ئەوەی ئەمڕۆ ئەنجامی دەدەیت دیاری دەکات داهاتووت چۆن دەبێت، دەبێت هەمووی بەجێبهێڵیت، هەرچییەک بێت دەبێت لە دوای خۆت بەجێیبهێڵیت، دەبێت خۆت برینەکانی خۆت چاک بکەیتەوە، دواتر چی ڕوودەدات؟ دەبینیت ئەو بارستە زەبەلاحە سێ پیتیەی کە پێی دەڵێن خۆر، سەرەڕای هەموو شتێک، بە ڕووناکی دەدرەوشێتەوە و هێشتا باڵۆنەکانی هیوا بۆ ئاسمان بەرز دەبنەوە. ئەوکات ڕەنگە فرمێسکی خۆشی بسڕمەوە، تۆ چی دەڵێی؟

**مرۆڤە بەهێزەکان لە ئازارەکانیاندا بەدوای پەناگەدا ناگەڕێن، سەلامەتترین بەندەری مرۆڤ خۆیەتی.**

## سەلامەتترین بەندەر مرۆڤ خۆیەتی...

شتێک هەیە کە تێیدا دووبـارە و سێبارە هـەمان هەڵە دەکەین، و باوەڕمان پێی هەیە، ئەویش بیرکردنەوەیە لەوەی کە دەتوانین ئازارەکانمان کەم بکەینەوە بە هاوبەشیکردنی ... منیش لە هەموو ئازارێکمدا باوەڕم بەم شتە هەبووە، لەبیرم دەکرد کە هەموو جارێک هەمان هەڵەم دەکرد... بەو هیوایەی بارەکەم سووک بێت و باشتر بم، باوەڕم کرد...

کاتێک مرۆڤ بریندار دەبێت، دەیەوێت کەسێک شوێنی خوێنبەربوونەکە پاک بکاتەوە، خۆشی بوێت، بیهەژێنێت، ببێت بە مەرهەم بۆ برینەکەی، بـەڵام نازانێت باشترین دەرمانی مرۆڤ دیسان خۆیەتی. کەس ناتوانێت وەک خۆی بە بەزەییانە مامەڵە لەگەڵ برینی کەس بکات، مرۆڤ بەشە ونبووەکانی خۆی تەواو دەکات، شکانەکانی خۆی چاک دەکاتەوە، هەموو هیواکان لەناو خۆیدا دووبارە هەڵدەقوڵێنەوە، بە واتایەکی تر؛ ئەو شوێنەی کە هەموو هەست و سۆزێک تێیدا لەدایک دەبێت، دیسان دڵی مـرۆڤ خۆیەتی، لە بنەڕەتدا مـرۆڤ بەتەنیایە،

ئەوانەی دەوروبەرت تەنها ڕۆڵ دەگێڕن، لە کۆتاییدا ڕۆژێک ڕۆڵەکەی کۆتایی دێت و مرۆڤ دیسان بە تەنیا دەژی، هەموو جارێک ئەمەم لەبیردەکرد. ژیان هەمیشە وای لێکردووین بگرین و پێبکەنین، کە دەگریاین چاوەڕێمان دەکرد فرمێسکەکانمان بسڕدرێنەوە، ڕووی نەدا.

دواتر ڕاهاتین فرمێسکی خۆمان بسڕینەوە، بەڵام پاشان زیاتر گریاین، ئەمجارە چاوەڕێی ئەوەمان نەدەکرد فرمێسکەکانمان بسڕدرێنەوە، بەڵکو چاوەڕێی ئەوە بووین کە کەسێک بێت و بە توندی لە باوەشمان بگرێت، بەڵام دووبارە ڕووینەدا، یان شتێک هەڵە بوو، یان بڕیار بوو شتەکان هەر بەم شێوەیە بن، وا نەبێت چۆن ژیان فێری بەهێزبوونی دەکردین؟

**لە ژێر بەهێزبووندا تەنیاییەکی قووڵ هەیە، مرۆڤی بەهێز تەنیایی لە خۆیدا قبوڵ کردووە، مرۆڤی بەهێز دەزانێت کە هەمیشە تەنیایە، لە کاتێکدا ئەو کەسانەی کە پێی وایە برینەکەی سارێژ دەکەن پاشەکشە دەکەن بۆ ماڵەکەی، و لە کاتێکدا هاوسەرەکەی لە جێگادا ڕوو لە تەنیشتی دەکات، دەزانێت تەنها خۆیەتی، واتە لەگەڵ خۆیدا دەمێنێتەوە.**




مرۆڤ چۆن دەتوانێت هێز لە کەسێکی تر وەربگرێت ئەگەر لە هەموو بارودۆخێکدا بە تەنیا بێت؟ ئەو سەرچاوە هێزەکەی لەناو خۆیدایە، هەر بۆیە مرۆڤی بەهێز لە ئازارەکانیدا پەنا بۆ هیچ بەندەرێک نابات، سەلامەتترین بەندەری مرۆڤ خۆیەتی.

## هەندێک ماڵئاوایی لەبیرنەکراوە...

شوێن هەیە مرۆڤەکان یادەوەرییەکانی خۆیان تیایدا دەشارنەوە، هەندێکیان کاتێک ئەو بۆنە دێت کە لەهی ئەو دەچێت لەوێدا دەیشارێتەوە، یاخود هەندێکیان هەر کاتێک دەنگێک وەک دەنگی ئەو بێت لەوێدا دەیشارێتەوە... ڕەنگە هەر لەبەر ئەوەش بێت هەندێک ماڵئاوایی هەرگیز لەبیر ناکرێت، چونکە هەر کاتێک گوێت لەدەنگێگ دەبێت کە لە هی ئەو دەچێت یاخود بۆنێک، دووبارە هەموو یادەوەرییەکانت بیردەکەوێتەوە لەگەڵ چەندین شتی تر.

منیش هەموو یادەوەرییەکانم لەبیر بوو... ماڵئاواییم هەمیشە وەک خۆی ماوەتەوە لە یادەوەرییەکانمدا، نە ئازارەکە کەم بووەتەوە و نە ڕاهاتووم، شتێک لە جانتای یادەوەریمدا کەڵەکە بووە لەگەڵ تێپەڕینم لە هەموو شارێکەوە، لە هەموو ڕۆحێکەوە، لە هەموو چیرۆکێکەوە. هەمیشە هەمان شت بوو کە کاتێک گوڵەکەم وشک دەبوو، باڵندەکەم مرد، یان گۆرانییەکی دیکە تەواو دەبوو، هەمان هەستم هەبوو.

ڕەنگە بە گرنگیدان بەو شتانەی کە ئازارم دەدەن پێگەیشتبم، نازانم، لەگەڵ هەر لەدەستدانێکم کە کەمێک زیاتر بەهێزتری دەکردم چێژوەرگرتنم لە ژیان زیاتر دەبوو، پاشان تێگەیشتم کە حەزێک لە مندا بەجێماوە بە تێپەڕبوون بە سەختی و ئازار و زیـان و بەهێزبوون و کۆکردنەوەی بڕین، لە دوای ئەو جەنگانەی لێی دەردەهاتم وەکو بەلەمێکی بچووک بووم کە ئیتر لە شەپۆلە گەورە بەرزەکان نەدەترسا...

بەو شێوەیەی بەلەمەکە دەستخۆشیم لەخۆم دەکرد بۆ سـەربـەرزی و بەهێزییەکەم، سوپاس بۆ خوا ژیانیش هیچ وازی لە تاقیکردنەوە نەهێنا. لەگەڵ دەرچوونم بە سەبرەوە لە تاقیکردنەوەیەکی تر، پرسیارەکانی زیاتر و قورستر دەکرد، بەبێ ماندووبوون، بەبێ وازهێنان ... منیش لە هەوڵدان بێزار نەبووم، بە بیرکردنەوە لە سەرکەوتنی پێشووم، هێزم بەخشی بە لقە لاوازەکانم، پاشان هەمیشە بەهار دەهات، دووبـارە و دووبارە...

ئێستا جارێکی تر بە شارێکی تردا تێدەپەڕم، پێویست ناکات وەسفی ئەو تاڵییە بکەم کە هەستم پێدەکرد، بە درێژایی ڕێگاکە سەوزاییە ... گوڵ لەسەر دارەکانە ... جارێکی تر بەهارە، منیش خەونگەلێک کۆدەکەمەوە کە لەگەڵ بەهاردا دەگونجێت، دەزانم هەموو ڕێگایەک بەرەو چیرۆکێکی نوێم دەبات.

## شتێک نییە بە ناوی ڕێکەوت...

هەندێک جار هەست دەکەم لە هەندێک شاردا تەواوم، هەوا، شەقامەکان، بۆنی گوڵەکان، ئارامیی ئەو شارە شتێک تەواو دەکات لە مندا کە ساڵانێکە لەدەستمدابوو، بەدڵنیاییەوە ئەم هەستانە بەڕێکەوت نییە،

ئەو شەپۆلە توندانەی کە بەر کەنارەکانی "بۆزجا"دا دەکەوتن، لە شێوەی چەن دڵۆپێکی بچووک دەگەیشتنە لای قاچم، و چەند مۆمێک لەسەر مێزەکە کە وا خەریکە دەکوژێنەوە...

من و هاندان لە بەرامبەر یەکدا دانیشتبووین، بیرمان لە هەمان شت دەکردەوە. وەک ئەوە وابوو کە هەردووکمان ساڵانێک لەمەوبەر بەم دوورگەیەدا تێپەڕیبێتین، وەک ئەوە وابوو ڕۆحمان لێرە لەدایک بووبێت و دواتر لە شوێنێکی تردا بڵاوببێتەوە، ڕەنگە ئەمە هۆکارێک بووبێت کە کاتێک هاتین بۆ دوورگەکە هەستمان بە غەریبی نەدەکرد، دڵنیام جارجار هەست بە هەمان هەست دەکەیت، من بەمە دەڵێم دۆزینەوەی سەر بە کوێیت، ئەو شوێنەی وا هەست بکەیت تۆ سەر بەوێیت...

مرۆڤ هەیە سەر بە شارێک و وەرز و کەسێکە، هەندێکیان بەبێ بینینی دەریا ناتوانن بژین، بۆ هەندێکیان سەوزایی، بۆ هەندێکیان گەرمای هاوین، بۆ هەندێکیان بای پاییز ... بەڵام شتێک هەیە هەرگیز ناگۆڕێت، مرۆڤ هەمیشە هەست دەکات سەر بە دڵێکە کە ڕەنگدانەوەی خۆی تیایدا دەدۆزێتەوە، هەر بۆیە گرنگ نییە لە کوێ بێت، هەندێک شوێن جوانن کاتێک ئەو دڵە لەگەڵت بێت.

هاوڕێیەتیش هاوشێوەیە، مرۆڤەکان هەمیشە کەسانێک کۆدەکەنەوە کە لە خۆیان دەچن، هەر لەبەر ئەمەشە هەمیشە کاتێک سەیری هاوڕێکەت دەکەیت خۆت دەبینیتەوە تیایدا، ئێستا کە سەیر دەکەم بەڵێ هەمیشە خۆم لە کەسانی تەنیشتمدا دەبینمەوە، من لە شارێکدا دەژیم کە هەست دەکەم سەر بەوێم، دیسانەوە پاییزم زۆر خۆشدەوێت و لە پایزدا باشترین بابەتەکانم دەنووسم، وە دەزانم ئەوە بە ڕێکەوت نییە، چونکە شتێک نییە بەناوی ڕێکەوت.

"هەندێک یەکترناسین و چاوپێکەوتن
لە پێشتردا دیاری کراوە،
ڕەنگە ئەمە بێت کە ئێمە پێی دەڵێین
چارەنووس."

## عەشق لەناو دەنکە بەفرێکدا شاردراوەتەوە

دوا شەوی مانگی شوبات بوو، لە پەنجەرەی وەرشەکەیەوە سەیری دەرەوەی دەکرد، کتێبفرۆشەکە "خوشکە ئایسون"، دەبێت هێشتا دوکانەکەی دانەخستبێت، چونکە بۆنی کتێبەکان دەگەیشتە پەنجەرەکەی.

ئەم شەقامەی لە سایەی "خوشکە ئایسون" دۆزیبویەوە کە ساڵی ڕابردوو لە هۆتێلی "کیتابئێڤی" ناسیبووی. کاتێک هاتبووە دوکانەکەی بۆ ئەوەی لە گەڕانەوەی لە "بۆرسا" کوپێک قاوە بخواتەوە، کە شەقامەکەی بینیبوو یەکسەر بڕیاری دابوو کە ئەمە ئەو شوێنەیە کە بەدوایدا دەگەڕێت بۆ وەرشەکەی، دوو نهۆمە چۆڵەکەی خانووە دارەکەی پێکەوە بەکرێ گرتبوو، دوای ئەوە فریشتەی ئیلهامی هەمیشە لە لای بوو، ئەو کتێبانەی

دەینووسی، ئەو تابلۆیانەی کە دروستی دەکرد، یەک لە دوای یەک دەهاتن.

ئەم خانووە دارە خۆشەویستە ئێستا سەرەڕای کەوتنی بەفر لە دەرەوە ناخی گەرم دەکردەوە، بەفر دەباری و دانەکە پەتۆی سپی تەمی شەوەکەیان دەڕازاندەوە، هەموو ڕەنگەکان لەسەر پەڕە سپییەکە بوون؛ یەکێکیان سوور، یەکێکیان پەمەیی، یەکێکیان شین... ڕەنگەکان وەک پەلکەزێرینە سەرسامکەربوون، کوپێکی دیکەی لە قاوەکەی خواردەوە، کە بە توندی بە دەستەکانیەوە گرتبووی. فریشتەی ئیلهامی هەر لە ئێستاوە لەسەر شانی دانیشتبوو، لە گوێیدا چرپەی دەکرد کە چی ڕوودەدات لەسەر ئەو کانڤاسەی کە بەهۆی پریشکەکانی شووشەکەوە ڕەنگکرابوو.

ئەو خەریکی تەواوکردنی ئامادەکارییەکانی کۆتایی بوو بۆ پێشانگای نیگارکێشی، کە لە ناوەڕاستی مانگی ئازاردا دەکرایەوە، دوا تابلۆشی لەبەردەمیدا بوو، بەڵێ دەبوو ئەمشەو ئەمەی لەسەر کانڤاسەکەی نەخشاندبایە؛ ئەو شێوازەی کە دەنکە بەفرەکان هەیەتی... سەرەتا دەبوو کانڤاسەکە سپی بێت، پاشان ڕەنگەکان دەبێت ژیان ببەخشن بە وێنەکە، تابلۆکەی هەناسە بدات، وەکو هەناسەی خۆی، ڕەنگە تەنانەت ناوی پێشانگای تابلۆش لەم چوارچێوەیەوە هاتبا "دەنکە بەفر".

مۆسیقایەکی بە کزی لە ڕادیۆ کۆنەکەی لای ئاگردانەکەوە ئیشپێکرد، لێدانی فلْچە خێراتر و خێراتر دەبوو، کاتژمێری دیوارەکە دینگ دۆلی تازە، سێ جار لێی دابوو. لە کۆتاییدا ئایکۆنی کاتی بۆ وێنەکە زیاد کرد و هەروەها فۆنیکسێکی بچووکیش .. . چەند هەنگاوێک بۆ دواوە ڕۆیشت. سەیری کێشراوەکانی کردەوە، چاوەکانی قوڵتر و قوڵتر دەبوونەوە بۆ ناو وێنەکە، ئازارێکی بێ مانا لە گۆشەی دڵیدا هەبوو.. وەک ئەوە وابوو فۆنیکسەکەی کە لە خۆڵەمێشەکەی درووست بوو بوو، جارێکی دیکە لەناو جەستەی ئەم پیاوە ونبووەدا زیندانی کرابێت، جەستەی لە ئازاردا بوو وەک ئەوەی هەرگیز جارێکی تر لەدایک نەبێتەوە.

دوای ساڵانێک لە بەکارهێنانی ڕەنگی ڕەساسی، کێشانی زەیتی ئێستا، وەک خاکێکی نوێ وابوو کە بدۆزرێتەوە بۆ ئەو، هەناسەیەکی نوێ بۆی بگیرێت. بوومەلەرزەکانی مێشکی لەسەر کانڤاسەکان فڕێدرابوون، پاشان بە خۆشەویستی ڕازێنرانەوە، بە حەسرەت ڕازێنرانەوە، بەریەککەوتنی بێهیوایی حەسرەت و خۆشەویستی لە کانڤاسەکانیدا ژیانی دەدۆزیەوە، تەوەری گشتی بۆ ئەم پێشانگایە لەسەر ئەم هەستانە بوو، تابلۆکانی تر تەواو بووبوون، تەنها بوومەلەرزەکەی ئەم پیاوە بێدەسەلاتە خەریکی دروستکردنی لەرزین بوو لە دڵیدا، وەک

ئەوە وابوو ڕۆحی لە ڕۆحیدا ئازار بچێژێت.

چاوی لەو شوێنە لابرد کە لەسەر تابلۆکە گیربووبوو، و پەنای بردە بەر بەزەییترین بەشی ژوورەکـە، کە بەرەو کاتژمێرەکانی بەیانی سارد دەبـووەوە، لەسەر جێگاکەی... کاتێک خۆشی و چێژی تەواوکردنی زنجیرەیەکی تر لەگەڵ ئازاری ناوەوە تێکەڵ بوو، گۆڕا بۆ هەستێکی وەسف نەکراو. چاوەکانی کە تەمیان دەکرد، لەسەر ئەو بالیفەی کە بە نەرمی دەستی دەدا بە ڕوومەتەکەی، زۆری نەخایاند خۆی دەخستە قووڵترین و جوانترین خـەوەوە، سبەینێ بەیانی لـە خەو هەڵدەستا...

دوای دە ڕۆژ ... سێ ڕۆژ مابوو بۆ پێشانگاکە، هاوڕێ نزیکەکەی "سێلین" یارمەتی دەدا لە ئامادەکارییەکان، لە یەکەم ڕۆژی پۆلی هەشتەمدا چاویان بە "سێلین" کەوتبوو، لە ڕیـزی پێشەوەی ئـەو پۆلـەدا وەسـتابوون کە لـەبـەردەم قوتابخانەکەدا کۆبووبوونەوە، بە بێدەنگی، "ئیلول" پێی باش بوو وەک هەموو کەسێک لە دوورەوە سەیری بکات، کاتێک بۆ ئەرکێک لە کتێبخانەی شارەکە یەکتریان بینی بوو، "ئیلول" ئەو ڕۆژە بۆی دەرکەوتبوو دەبێتە باشترین هاوڕێی "سێلین". لە ماوەیەکی کەمدا بوونە هاوڕێ، کە دەیانتوانی هەموو خۆشی و ناخۆشییەکانیان لەگەڵیاندا بەش بکەن، دوای ئەوە هاوڕێیەتییان

بەردەوام بوو. نە مەودای نێوانیان و نە کاتەکانی تێپەڕبوون هێزی شکاندنی ئەم هاوڕێیەتییەیان هەبوو.

"ئیلول" کاتێک بیری لە ڕۆژانی کۆن دەکردەوە، بە زەردەخەنەوە سەیری "سێلین"ی دەکرد، لە قۆناغی ئامادەییدا قژی کورت کردبویەوە و دوای کۆلیژ جارێکی دیکە بەو شێوەیە کورتی نەکردبوەوە، ئێستا ئەم کچە باڵابەرز و دڵڕفێنە یەکێک بوو لەو کەسە دەگمەنانەی کە مانای بە ژیانی دەبەخشی.

"سێلین" تابلۆکانی ڕێکخستبوو، و چیرۆکی هەر تابلۆیەکی لە چوارچێوەی جیادا دانابوو، ئەگەر چیرۆک نەبوایە مانای ئەو شتانە چی بوو کە لەسەر کانڤاسەکە دانرابوون؟ لە کاتێکدا چیرۆکی هەموو شتێکیان بەیەکەوە باس دەکرد، لەناو کەفی کوپێک قاوەدا، لەبەردەم پەنجەرەکەدا جێگەی خۆیان گرتەوە و چیرۆکی ئەم ڕۆژە جوانەیان بەیەکەوە باس کرد. "سێلین" ئەو چوارچێوە بەتاڵەی لە دەست دا بوو کە بۆ کلوی بەفرەکە ئامادەی کردبوو، لە "ئیلول"ی پرسی؛ بۆچی شتێکت بۆ ئەم تابلۆیە نەنووسیووە؟

"ئیلول" کوپەکەی کە بە هەردوو دەستی بە توندی گرتبوو، خستیە سەر مێزەکە، پاشان بە نەرمی لە شوێنی دانیشتنەکەی هەستا و سەیری تابلۆی دتکە بەفرەکەی کرد، "سێلین" سەیری دەکرد و چاوەڕێی وەڵامی دەکرد، بۆ ماوەیەکی زۆر

چاوی لەسەر تابلۆکە بوو، کاتێک سەیری وێنەکەی دەکرد پەیوەندییەکی سەیری لەگەڵ ئەو پیاوەدا دروست دەکرد، نەیتوانی مانای ئەم پەیوەندییە بخاتە ڕوو یان بیخاتە وشەوە.

گوتی؛ "چونکە ناتوانم مانای ئەوە بدەم کە هەستی پێدەکەم" وە ڕووی لە "سیلین" کرد؛ "باشترە ئەگەر بە بەتاڵی بمێنێتەوە".

"سیلین" هەوڵیدەدا لە "ئیلول" تێبگات، دڵنیا بوو کە "ئیلول" لەو تابلۆیەدا شتێکی لە خۆی دەدۆزییەوە.

ڕۆژی شەممە یەکەم ڕۆژی پێشانگاکە بوو، و هەرچەندە سێیەم پێشانگای بوو، بەڵام "ئیلول" وەک ئەوەی یەکەم ڕۆژی پێشانگەی بێت بەپەرۆش بوو، سەردانکەران لە زیادبووندابوون، چی لەوە دڵخۆشکەرتر دەبوو بۆ هونەرمەندێک؟

قژ و ماکیاژەکەی بە وردی لەلایەن ئارایشتگاکەیەوە ئەنجامدرا بوو، بە جلە بێجییەکەیەوە هەستی بە جوانی خۆی دەکرد... هەموو شتێک بۆ ئەوە بوو کە ئەمڕۆ هەست بە باشی بکات، جارجار باسی تابلۆکانی بۆ میوانەکانی دەکرد، ناوبەناو لەگەڵ هاوڕێ نزیکەکانی کە دەهاتن بۆ پێشانگاکە گفتوگۆی دەکرد.

نزیکەی سێ کاتژمێر دوای کردنەوەی پێشانگاکە زانی کە تابلۆی دەنکە بەفرەکە فرۆشراوە، دیار بوو هەوادارێکی

هونەری نهێنی بوو، چونکە هیچ شوێنەوارێکی لەسەر خۆی نەهێشتبوەوە، هەرچەندە لە هەموو تابلۆکان گرانتر بوو، بەلام یەکەم تابلۆش بوو کە فرۆشرا. ئەمەش "ئیلول"ی هەم دلخۆش و هەم دلتەنگ کرد، دوا بەرهەمی بوو و هەروەها ئەو تابلۆیە بوو کە زۆرترین کاریگەری لەسەری هەبوو، وەک ئەوە وابوو کە هەست و ئەزموونی جیاوازی لەو تابلۆیەدا شاردبێتەوە، ڕەنگە ئەو خەم و پەژارەی بۆ ئەوە بووبێت کە جارێکی تر دەیزانی ئەو تابلۆیە نابینێتەوە.

پێشانگاکە بۆ ماوەی دوو ڕۆژ بەردەوام بوو، ئێوارەی یەکشەممە کۆتایی هات و تەواو ماندووبوو بوون، زۆربەی تابلۆکان فرۆشرابوون و ئەمەش بەو مانایە بوو کە خەلک هونەر و چیرۆکەکانی ناو تابلۆکەیان خۆشدەویست، ئەمەش "ئیلول"ی زۆر دلخۆش کرد.

ئەو ئێوارەیە، چوونە دەرەوە بۆ ئاهەنگ گێڕان، لە شوێنێکی شاری "ڕومەلی هیسار"ی گفتوگۆی خۆشیان کرد و بە دلی خۆیان خۆشیان بەسەر برد، لە کۆتایی شەودا قاوەکەیان خواردەوە و بەو دلخۆشیەی کە پێشانگای ئەمسالیان بەم شێوەیە تەواو کردووە هەناسەیەکی قولیان لە ئیستەنبول دا هەلمژی.

چەند ڕۆژێک دواتر ... لەگەل نزیکبوونەوەی مانگی نیسان،

کارکردن لەسەر کتێبەکە خێراتر بوو، ئامادەکاری دەکرد بۆ چاپکردنی کتێبی دووەمی خۆی، لە یەکەم کتێبیدا خۆشەویستی شەو و تەنیایی و باران بە وەسفێکی بچووکەوە کۆکردەوە و لەم کتێبەدا بە ڕۆمانێکی سەرنجڕاکێش لە شێوازی لێکۆڵینەوەیەکی شوێنەواردا چاوی بە خوێنەرانی دەکەوت.

لە وەرشەکەدا لەسەر مێزەکەی بوو، درەنگانی شەو بوو، یان تاریکییەکی تەواو بوو، تەنها ئەو دوو مۆمەی لەسەر مێزی کارەکە دەسووتان ڕۆشنایی دەخستە سەر هەستەکانی، ئەو خەریکی نووسینی بەشی هەشتەم و کۆتایی ڕۆمانەکە بوو، هەر لەو کاتەدا ئیمەیڵێکی بۆ هات، لە بەکارهێنەرێکەوە بووە بە ناوی "مێرت دەمیر"، پێشتر ئەم ناوەی نەبیستبوو، بەگشتی ئەم جۆرە ئیمەیڵانەی لە خوێنەرانیەوە بۆ دەهات، ئیمەیڵەکەی کردەوە و دەستی کرد بە خوێندنەوە.

"مێرت" لە پۆستەکەدا باسی "ئیلول"ی دەکرد، ئەو شتانەی بۆ "ئیلول"ی نوسیبوو وەک ئەوە وابوو "ئیلول" خۆی نوسیبێتی، چۆن هەموو شتێکی دەزانی؟ لە نیگای فرمێسکاوی چاوەکانییەوە تا خاڵەکەی سەر لێوی، لە گۆشەی ئیلهامبەخشەکەیەوە کە لە لای دەریا شاردرابووەوە، کە ڕۆژانی یەکشەممە نانی بەیانی دەخوارد لێی و ڕۆژنامەی دەخوێندەوە، تا دەگاتە ئەو پشیلانەی کە لەکاتی ڕۆیشتن بەرەو وەرشەکە خۆراکی

پێیان دەدا! "مێرت" چ جۆرە جیهانێکی لە گەردوونی "ئیلول"دا دروست کرد، لە کاتێکدا تەنانەت ئەو کەسانەی لەگەڵیدا دەژین زۆربەی ئەم تایبەتمەندیانەیان نەدەزانی، ئەو چۆن دەیزانی؟! چ جۆرە بەهارێک بەسەر بابەتەکەتدا هاتبوو کە بە "ئیلولەکەی من" دەستی پێکردبوو؟ ئایا ئەم پیاوە نهێنییە ئەم هەموو کاتە وەک سێبەرەکەی لەگەڵیدا ژیاوە؟

"مێرت" بەردەوام بوو لە قسەکانی و نوسیبووی؛ کە لە دوای خوێندنەوەی یەکەم کتێبی "ئیلول" بە ناوی "کاتێک ئەم شارە بە سپی بۆیە دەکرێت، بۆنی تۆی لێدێت" بڕیاری داوە "ئیلول" بناسێت، چونکە خۆی لە کتێبەکەدا بینیبوەوە، و لەبەرامبەردا ئەویش نووسینێکی نووسیبوو بەناوی "مرواری ڕەش".

دوای خوێندنەوەی بابەتەکە، "ئیلول" کەمێک وەستا، بیریکردەوە لە کاتێکدا ئەو بۆ کەسانێکی دەنووسی کەسی تریش بۆ ئەوی دەنوسی؟ لە کاتێکدا "ئیلول" بیری لە پایز و نووسینی شیعر دەکردەوە، کەسێک ئیلهامی لە پایز وەرگرتبوو و خەریکی نووسینی "ئیلول" بوو؟ سەرسام بووبوو، لە گۆشەکەیدا کە لە تەنیشت کەنار دەریاکە دانیشتبوو و دەینووسی، کەسێکی تریش سەیری دەکرد و دەینووسی، ڕەنگە ئەمجارەیان، ژیان هەموو ڕێکەوتەکانی لەبەردەمیاندا کۆکردبێتەوە، یان ڕەنگە هەمووی فێڵێکی جیهانی مەجازی بێت، پەپوولەیەک تەنها

لە باڵەکەی کەوتبێتە خوارەوە، نەیدەزانی، دواتر بیری لەوە دەکردەوە کە ئایا پێویستە وەڵامی بداتەوە یان تەنها لە قووڵایی ناخیدا بیهێڵێتەوە.

بەم هەموو بیرکردنەوەیەوە لەسەر کۆمپیوتەرەکەی هەستا و بەرەو پەنجەرەی وەرشەکە ڕۆیشت، دوایین جار کە لێرە بوو تێکەڵ بە تاریکی بوو، و یاری بە هەستەکانی دەکرد، شوبات بوو، و بەفر دەباری و هەموو شوێنەکە بۆنی خۆشەویستی لێدەهات، کاتێک شارەکەی بە هەموو پاکییەکەیەوە سپی دەکرد. ئێستا، ئەو ئەستێرانە هەبوون کە ئاهەنگی بەهاریان دەگێڕا، کە سێبەری چرای شەقامەکەیان دانابوو، چەند سەعاتێک دواتر و بەیانیان شەبنەمی بەیانی تازە گەڵاکانی تەڕ دەکرد، کاتێک خۆر لە ڕێگەی پێڵوی ماندوویانەوە زەردەخەنەی بۆ دونیا دەکرد، پەپوولەکان بۆ هەمیشە دەفڕین و ئەوانەی بە قووڵی جارێک عاشقی ئەم شارە بوون دووبارە عاشقی ئەم شارە دەبوونەوە.

سەرەڕای هەموو شتێک، جێهێشتنی هەموو هەست و سۆز و خەمەکان لەو پەنجەرەدا کاتێک سەری بەر بالیفەکە دەکەوت ڕەنگە نیعمەتێک بووبێت کە وەرشەکە پێشکەشی "ئیلول"ی کردبوو، لەو پەنجەرەیەدا بیری دەکردەوە، لەو پەنجەرەیەدا بیری دەکردەوە و ون دەبوو، لەو پەنجەرەیەدا دەینووسی، لەو

پەنجەرەیەدا وێنەی دەکێشا، ئێستاش کاتی ئەوە بوو بخەوێت، بەڵام نەیدەتوانی، نەیدەتوانی ئەو شتانە لەبیر بکات کە "مێرت" بۆی نوسیبوو، دڵی یاری لەگەڵ دەکرد.

گڵۆپی شەوی سەر مێزی تەنیشت جێگاکەی داگیرساند و دانیشت، دەیویست شتێک بۆ "مێرت" بنووسێت، بەڵام عەقڵی رێگری دەکرد، دڵی وەکو منداڵێک کە بۆ یەکەمجار پاسکیلی لێ دەخورِی بەپەرۆشەوە لێی دەدا، بە گوێی ئەقڵی نەکرد و دووبارە سندوقی ئیمەیڵەکەی کردەوە، پۆستێکی تر گەیشتبوو، بە ترسەوە دەستی لە پۆستە هاتووەکان دا،" مێرت" ویستویەتی بە بارانەکانی ئەم ژنە تەڕ بێت کە دەیتوانی ئەوەندە باش وەسفی تەنیایی بکات، وە "ئیلول" بۆ یەکەمجار بوو پیاوێکی وەها سۆزداری دەناسی، وەڵامی ئیمەیڵەکەی "مێرت"ی نەدابووەوە، بەڵام ئەوەندە پەرۆش بوو کە ڕەنگە ئەگەر وەڵامی دابایەوە تەنها قسەی بێمانای دەکرد.

کەمێک دوودڵ بوو لە قبووڵکردنی ئەو بانگهێشتنامەیەی کە خوێندبوویەوە، وەڵامی ئیمەیڵی دووەمی "مێرت"ی نەدایەوە، ڕۆژی دواتر لە پەیامە نوێیەکەدا کە بۆ سندوقی پۆستەکەی نێردرابوو بە ناوی "دەنکە بەفر" ئەمجارەیان "مێرت" باسی خۆی دەکرد، ئەویش بە هەمان شێوەی "ئیلول" دەینوسی، "ئیلول" بڕیاریدا ئەم پیاوە بناسێت کە لە خۆی دەچێت، لە وەڵامدا

پێشنیاری کرد کە پاشنیوەڕۆی پێنجشەممە لە خواردنگەیەکی ماسی لە بۆسفۆر کۆببنەوە.

ئەو ڕازی بووبوو... بڕیار بوو چەند ڕۆژێکی تر یەکتر ببینن، بەڵام شتێکی تر هەبوو کە بیرکردنەوەکانی "ئیلول"ی گرژ دەکرد، ئەگەر "مێرت" ئەوەندە باش "ئیلول"ی نەناسیبا، بۆ نموونە هەموو ژیانی لەبەر نەکردایە بۆ ئەوەی "ئیلول" بەدەستبهێنێت. یان ئەگەر "ئیلول" هەرگیز ئەو کتێبەی نەنووسیبایە، ئایا ژیان هێشتا دەیهێنانە سەر ڕێگای یەکتر؟ بۆ نموونە دەیانتوانی بە ڕێکەوتێکی سادە بە پێکدادان لە گۆشەی شەقامێک، یان لە ژینگەی هاوڕێیەکدا یەکتریان بناسیایە؟ نەیدەزانی.

"ئیلول" ئێوارەی پێنج شەممە نزیکەی کاتژمێر شەش وەرشەکەی جێهێشت، و بە تەکسی ڕۆیشت بۆ ئەوەی بچێتە خواردنگەکەی سەر کەشتی بۆسفۆر، نزیکەی سێ خولەک لە وەرشەکەوە دوور بوو، بەڵام پاژنە بەرزەکانی پێیەکانی کەمێک ڕەق بوون لەسەری.

خۆی زۆر بە جوانی ڕازاندبویەوە، جلە ڕەشەکەی، قژە زەردەکەی جوانتر دەردەخست، ماکیاژە سادەکەی جوانییەکەی لەگەڵ سروشت تێکەڵ بووبوو، بۆنەکەی گوڵی بەهاری بیردەخستیەوە.

دوای نزیکەی پێنج خولەک، لەبەردەم خواردنگەکەدا کاتێک خەریک بوو پارەی تەکسییەکەی دەدا بەرپزێک دەرگای تاکسییەکەی کردەوە و دەستی درێژ کرد، کات لەوێ وەستا، بە جولەی خاو دەستی بۆ دەستی درێژکراوی "مێرت" برد، ئەو بەرپزە بالابەرز و قژ قاوەیی چاو شینی دەریایی و قاتێکی کوالیتی بەرز کە وەک رەنگی چاوەکانی بوو، زەردەخەنەی بۆ "ئیلول" کرد.

"ئیلول" کاتێک "مێرت"ی بینی، هەستی کرد کە چاوی بە کەسێک دەکەوێت کە سالانێکە دەیناسی، هەندێک رۆح بۆ مرۆڤ ئاشنان، بەو نزیکییە رۆحی بەناودا خزاند و رۆحی "مێرت"ی لە باوەش گرت، زەریاکانی ناوەوەی ئاوسان و دەستیان کردبوو بە لێدانی کەنارەکانی، هەرچەندە "ئیلول" لەو ساتەدا ئەوەندە بە پەرۆش بوو کە نەیدەتوانی مانای ئەمانە لەیەکبداتەوە، بەلام خۆشەویستی لە یەکەم بینیندا بە هەموو خانەکانیدا بلاوبووبووەوە.

مێزێک لە کەناری دەریای خواردنگەکەدا بە تایبەتی بۆیان ئامادە کرابوو، مێزێکی سپی، سێتی ماسی شین و سپی تۆخ، مۆم و گلۆپی سپی، و خاوەنی درەوشاوەترین روناکی شەو... "مێرت" و "ئیلول" ... وەک ئەوە وابوو چەند مانگێک بێت یەکتریان ناسیبێت، وشەکان نەدەوەستان، پێکەنینەکانیان،

یەک لە دوای یەک، وەک ئەوەی منداڵە هارەکەی ناخی "ئیلول" بیەوێت دەربچێت ، "مێرت" هەر جارێک باسی خۆی دەکرد، وەک ئەوە وابوو کە باسی "ئیلول" بکات، لە کۆتایی تەمەنی سی و چوار ساڵیدا، هەمیشە باری ڕۆحی شیعری لەگەڵیدا بوو، دەرچووی بەشی دەروونناسی بوو، فەرمانبەری حکومی بوو، زۆر شتیان لەیەکتر دەچوو...

**بێ ئەوەی بزانن چۆن کات تێدەپەڕێت، خۆر لە ئاسۆدا نەمابوو و مۆم و گڵۆپەکان لەسەر مێزەکانیان دەستیان کرد بە درەوشانەوە.**

کەشتییەکان لە نزیک کەنارەکە تێدەپەڕین، ڕەنگە هەریەکەیان ئومێدیکیان دەگواستەوە، داوای مۆڵەتی لە "مێرت" کرد بۆ ئەوەی بچێتە دەست شۆرەکە، "ئیلول" بەرەو ژوورەوە ڕۆیشت، بۆ ساتێک وەستا، وەک ئەوە وابوو جەستە و ڕۆحی بیبەستێت، لە کاتێکدا هەموو شتێکی دەوروبەری بە خێرایی بەردەوام بوو لە سووڕانەوە، لەوێ بوو، ڕاست لەبەردەمیدا!

چاوەکانی دەلەرزین، لەناکاو هەموو ئەگەرەکانی تایبەت بە "مێرت" لەبەردەم چاوەکانیدا تێپەڕین، خێرا یەک لە دوای یەک ڕیزیان کرد و هەرچەندە هەموو ئەو وەڵامانەی دۆزییەوە

کە بەدوایدا دەگەڕان، بەڵام سەرلێشێواوییەکەی ڕێگەی نەدا یەکبگرن، خەریک بوو لە سەرسوڕمانیدا بمرێت، گریەیەک لە قوڕگیدا هاوار کرد؛ "بگری"!

بە خێرایی گەڕایەوە سەر مێزەکە و دانیشت، شلەژابوو، دەستی کرد بە سەیرکردنی چاوەکانی "مێرت"، وەک ئەوە وابوو ئێستا دڵیان قسە بکات نەک ئەوان، چەند خولەکێک بە بێدەنگی قسەیان کرد، "یلول" پرسی، "مێرت" وەڵامی دایەوە، ئەو وشانەی کە ڕژانیان ئاسان نەبوون بۆ گوتن، بۆیە بەم شێوەیە بە بێدەنگی دەڕژان، نەیدەتوانی بپرسێت چی لە مێشکیدایە، بەهەرحاڵ هەموو شتێک ڕوون نەبوو، "مێرت" "ئیلول"ی لە هەموو هەسارەیەکی گەردوونە بچووکەکەیدا جێگیر کردبوو.

"مێرت" خاوەنی ئەم خواردنگەیە بوو، لە جوانترین گۆشەی خواردنگەکە تابلۆکەی "ئیلول"ی لێبوو کە ئەوێی ڕازاندبویەوە، نەدەکرا نەزانێت ئەوە هی "ئیلول"ە ئەی وانیە؟

کەواتە چۆن "ئیلول" درکی نەکردبوو بەم پیاوە کە تەنها سێ خولەک لێی دوورە، کە چەند مانگێکە وەک سێبەرێک لەگەڵیدا دەژی؟ ئایا پێشتر هەرگیز پیاوێکی دەم بەخەندەی نەبینیبوو کاتێک هاتبووە ئەم خواردنگەیە؟ پرسیارەکان درێژەیان کێشا و لە بێدەنگیدا ون بوون.

"ئیلول" هێشتا سەری سوڕمابوو، کاتێک هاتەوە وەرشەکەی، بە زەردەخەنەیەکی گەورەوە لەسەر دەموچاوی، جانتاکەی فڕێدا بۆ لایەک، و لەسەر جێگاکەی پاڵکەوت. هەمیشە حەزی لە داگیرساندنی گڵۆپەکان نەبوو، ئیلهامی لە تاریکی وەردەگرت، سەرەتا تاریکی دەوری جەستەی دا، پاشان خەیاڵی "مێرت"... خۆی بۆ شەو بەجێهێشت، بەو شێوەیە جوان بوو، چرای شەقامەکە سەدان هەزار پرشنگی لە پەنجەرەکەوە دەهێنا و پەردەکان کرابوونەوە، چاوەکانی داخران، ئەو زەردەخەنەی بەسەر ڕوومەتەکانیدا بڵاوبووەوە، لەگەڵ خەودا تێکەڵ بوو.

بەیانییەکی تر، بە خۆشییەوە دەستی لە چاوەکانی دا، لە جێگاکەدا بازێکی دا و پەنجەرەی ژوورەکەی کردەوە، ئەو دەیویست نیسان بە هەموو درەوشاوەییەکەیەوە ڕۆحی بگرێتەوە، "خوشکە ئایسون" بەیانی زوو دوکانەکەی کردبووەوە و لەکاتی خواردنەوەی قاوەکەیدا لەسەر ئەو مێزەی لەبەردەم دەرگاکە دایدنابوو، کتێبی دەخوێندەوە، چاوەکانی لەناکاو وەستان کاتێک سەیری شەقامەکی دەکرد، لەناکاو چاوەکانی وەستا، بینی "مێرت" لەبەردەم ئۆتۆمبێلەکەی دانیشتبوو، چاوەڕێی دەکرد، تەنها هەندێک جل و بەرگی لەبەر کرد و چووە خوارەوە، کاتێک دەرگاکەی کردەوە، "مێرت" کەمێک شەرمی دەکرد و کەمێکیش بەپەرۆش بوو، بانگهێشتی کرد بۆ

ژوورەوە.

"مێرت" گوتی؛ سمیت و پەنیرم بۆ کڕیوویت، دەزانم تۆ حەزت پێیەتی، "مێرت" بەلایەنی کەمەوە چەنێک خۆی دەناسی "ئیلول"یشی ئەوەندە دەناسی.

"ئیلول" کەمێک زەردەخەنەی کرد و گوتی؛ "بێگومان ناتوانیت چای لەگەڵدا نەخۆیتەوە" و چووە پشتی بارەکە بۆ ئامادەکردنی نانی بەیانی، "مێرت" بە دەوری بەشی وەرشەکەدا دەگەڕا، دەستی لە کانڤاسەکان دەدا، سەیری بۆیاخ و قەڵەمەکانی دەکرد، سەیری جیهانی ئەو ژنەی دەکرد کە چەندین مانگە دەیویست لەگەڵیدا بێت، دوای ئەوەی "ئیلول" چەند جۆر قاپی نانی بەیانی لەسەر مێزە بچووکەکەی بەردەم شووشەکە دانا و چاییەکەی دەکردە ناو پەرداخێکی تەنکەوە، ڕووبەڕووی یەکتر دانیشتن.

"مێرت" سەیری چاوەکانی "ئیلول"ی کرد و گوتی؛ "دوێنێ کاتێک تابلۆکەت بینی هیچت لێم نەپرسی."

ئەوان لە هەمان کاتدا پێکەنین کە گوتی؛" من پرسیارم نەکرد، چونکە دەتوانم پێشبینی بکەم، تۆ هەموو شتێکت لەبارەی منەوە دەزانی، هەروەها دەتزانی کە من وێنەکێشم، بۆیە تابلۆکەت کڕیوە، وە دەزانیت بەڕاستی چی کۆمیدییە؟" من بانگهێشتم کردی بۆ شوێنەکەی خۆت؛ لە هەمان کاتدا "ئیلول"

زیادی کرد؛ دان بەوەدا بنێ، کاتێک ئەو ناوەم پێ گوتیت زۆر پێکەنیویت.

بێگومان "مێرت"یش دەیزانی کە ئەستەمە ئەوەندە ڕێکەوت ڕوویدات گوتی؛ "شتی وا هەر ڕوودەدات" هێشتا وەک ئەوەی نەزانێت مامەڵەی دەکرد، لەناکاو دەربڕینێکی جددی لەسەر دەموچاوی "ئیلول" دەرکەوت، "مێرت" یەکسەر تێگەیشت کە ناتوانێت وەڵامی ئەو شتە بداتەوە کە خەریکە پرسیاری لێدەکات.

پرسی؛ "کەواتە بۆچی ئەو تابلۆیەت کڕی کە تەنانەت چیرۆکێکیشی نەبوو"؟ وەڵامی دایەوە؛ "چونکە هەندێک جار وشەکان پێویستیان بە ڕوونکردنەوە نییە". لە ڕاستیدا لەو تابلۆیەدا زۆر شتی لە خۆیدا دەدۆزیەوە، بەڵام نەیدەتوانی بە "ئیلول" بڵێت، شتێک لەسەر ئەو تابلۆیە هەبوو کە ئازاری دەدا، بەڵام نەیدەتوانی دەریببڕێت.

"ئیلول" تەرکیزی بردە سەر بابەتێکی تر، بەبێ ئەوەی دەرفەتی بیرکردنەوەی پێبدات و پرسی؛" بچینە گالاتا، تۆ چی دەڵێیت؟"

"مێرت" وەڵامی دایەوە؛" با بڕۆین".

ئەو ڕۆژە و ڕۆژە زۆرەکانی دواتریش، بە تامی شەکر بوو بۆ هەردووکیان، یەکەم جار بوو کە "ئیلول" هەستی بە

هەستێکی ئاوا قووڵ و وەسف نەکراو دەکرد و بەڕاستی خۆشی دەویست، لە چاوی "مێرت"دا هەستی دەکرد وەک ئەوەی پەنای بۆ سەلامەتترین بەندەرەکان بردبێت، وەک ئەوە وابوو کاتێک لەم بەندەرەدا پەنای گرتبوو هیچ بایەک لە کەشتییەکانی ناخی نەدابێت، کاتێک دەستی دەگرت، وەک ئەوە وابوو دەستی بە ژیانەوە گرتبێت و هەناسەکەی "مێرت" بێت.

ئەو پیاوە بوو، کاتێک خۆر نەدەدرەوشایەوە، دەبووە ڕوناکی و گەرمی لە باوەشی شەوانی سارددا، ئەو پیاوە بوو، دەبووە ڕێچکە بۆی، کاتێک ڕێگەی خۆی نەدەدۆزییەوە، نیوەکەی تری "ئیلول" بوو، پێکەوە ئەو کارانەیان دەکرد کە پێشتر لە ژیانیاندا نەیانکردبوو و بە توندی دەستیان بە ژیانەوە گرتبوو، تەنانەت یەک ڕۆژیش نەبوو پێکەوە بەسەری نەبەن، بەو پێیەی هەردووکیان سەربەخۆ کاریان دەکرد، دەیانتوانی کاتێکی زۆر پێکەوە بەسەر بەرن، هەموو نەورەسەکانی ئیستەنبوڵ دەیانناسی، هیچ شەقامێک نەبوو لەبارەی ئەوانەوە نەزانن، یان شوێنێک نەبوو قاوەیان لێ نەخواردبێتەوە.

ڕۆمانە ڕۆمانسییەکانی "ئیلول" یەک لە دوای یەک بڵاو دەبوونەوە، و تا دەهات دەبووە نووسەرێکی بەناوبانگ و خوێنەرەکانی بەرفراوان دەبوون، لە بەرامبەردا "مێرت" خەریکی گۆڕینی خواردنگەکەی بوو بۆ زەوییەکی پڕ لە

"ئیلول"، ئەم شوێنە کە لە هەموو گۆشەیەکدا شوێنەواری "ئیلول"ی هەڵگرتبوو بۆنی "ئیلول"ی لێدەهات، "ئیلول" هەندێک جار لە وەرشەکەدا "مێرت"ی فێری وێنەکێشان دەکرد، هەندێک جاریش "مێرت" شیعری بۆ "ئیلول" دەخوێندەوە، وەرشەکە ببووە شوێنی ئیلهامبەخشییان، ماڵی عەشق، شەوەکان کۆتایی دەهاتن و ڕایاندەکرد بۆ ڕۆژەکانی خۆیان، ڕۆژەکانیش چاوەڕێی شەوەکانیان دەکرد.

ئەوان بڕیاریان دابوو ئەو ژیانە بژین کە بۆ یەکتریان تەرخان کردبوو، پێکەوە بژین و هاوسەرگیری بکەن، ساڵ و نیوێک بەسەر یەکتر ناسینیان تێپەڕیبوو، خۆشەویستە گەشەسەندوویەکەیان دڵێکی بچووکی پێبەخشیبوون... ئەگەر "مێرت" بیزانیایە کە منداڵێکیان دەبێت، ئەوا پێشتر خەونی بەو ڕۆژەوە دەبینی کە دەستە بچوکەکانی بگرێت، ئەوان دەبوونە سێ ڕۆح کە لە یەک ڕۆحدا مانایان دەدۆزیەوە، ئەوان دەبوونە عەشق.

بڕیار بوو چەند ڕۆژێک پێش ئەوەی مانگی ئەیلول ببێتە مانگی ئۆکتۆبەر هاوسەرگیری بکەن، "ئیلول" دەستی "مێرت"ی دەگرت و بە جلی بووکێنی کە جلێکی درێژ و گوڵی پاییز بوو، لەسەر ئەو فەرشە سوورە دەڕۆیشت، باوکی کۆرپەکەی هەموو شتێکی ئەو دەبوو، جیهانەکەی ئامادە بوو، تەنها پرۆڤەکانی

زاوا مابووەوە، هەموو شتێکی تر دەبووە دوا پرۆڤەیان لە یەکێک لە بوتیکە ناسراوەکانی نیشانتاشی.

"مێرت" چووبووە کابینەکە، بۆ ئەوەی قاتی زاوایەتییەکەی تاقی بکاتەوە، بەڵام هەرچەندە نزیکەی پانزە خولەک تێپەڕیبوو، نەگەرابویەوە. "ئیلول" چەند خولەکێکی تر چاوەڕێی کرد، چونکە ئاسایی بوو بەلایەوە کاتی پێبچێت، بەڵام کەس نەهات، پاشان گفتوگۆکەی لەگەڵ خاوەن بوتیکەکە پچڕاند و بەرەو کابینەکە ڕۆیشت و بانگی کرد، بەڵام وەڵام نەبوو، ترس بە دەمارەکانیدا دەڕۆیشت، دەرگای کابینەکەی کردەوە، "مێرت" لەسەر زەویەکە کەوتبوو، جیهانە بچووکەکەی لەناکاو تاریک بوو، چاوەکانی سەرگەردان بوون، نەیدەزانی چی بکات، داوای یارمەتی کرد.

"مێرت" نەدەهاتەوە هۆش خۆی.. "ئیلول" پاڕایەوە، دەستی دەهێنا بە ڕوومەتەکانی، یەکەم جار بوو بە هەستی لەدەستدان ئاشنابێت، هەرگیز حەزی لێی نەبوو، کاتێک "مێرت"ی دەبینی ئاوا کەوتووە زۆر باش تێگەیشت کە مرۆڤ هەندێک جار دەکرێت چەندە بێدەسەڵات بێت.

یەکسەر بە ئۆتۆمبێلی فریاگوزارییەکە ڕۆیشتن، "ئیلول" لە تەنیشت هاوسەرەکەی دانیشتبوو، دەستەکانی بە توندی گرتبوو، دەکرا ئەمە یارییەکی دنیا بێت بۆ "ئیلول"، بێ ئاگا لەو

زلەیەی کە دەیخوات کاتێک کۆتایی بەم یارییە دەهێنێت.

کاتێک گەیشتن، بە کۆریدۆرێکی گەورەدا تێپەڕین و بەلای ڕاستدا ڕوویان کردەوە، دوای پشکنینی یەکەم، پزیشکەکان "مێرت"یان دەبرد بۆ تۆمۆگرافی، ئەو ئامێرە سپییە ترسناکە وەک کفنێک دەیپێچایەوە، ماندووی دەکردیت، ناچاری دەکردیت، لە کاتێکدا "ئیلول" نەیدەویست بۆ ساتێک دەستەکانی واز لە دەستەکانی بهێنێت، چۆن دەتوانێت بۆ چەند خولەکێک لەناو ئەو ئامێرە ترسناکەدا بە تەنیا بەجێبهێڵێت.

لە کۆتایی ئەو خولەکانەی کە هێندەی ڕۆژان تێدەپەڕین تێپەری، "مێرت"یان بردە ژوورێک، پزیشکەکەی "خاتوو ئیلچین" "ئیلول"ی بانگهێشت کردبوو بۆ لای خۆی، ئێستا بۆچی ئەم سەردانە؟ بە دەستی ئارەقاوییەوە چووە ژووری "خاتوو ئیلچین".

"ئیلول" لە پەشۆکیدا دەلەرزی، ترسی هەبوو، "ئیلچین" سەرەتا هەوڵیدا ئارامی بکاتەوە و دڵنەوایی بدات، بەلام ئێستا کاتی ئەوە هاتبوو گوێی لە پشکنینەکان بێت.

چی ئەبوو ئەگەر گوێچکەکانی داخستبا؟ "ئیلول" گوێی لێ نەبووایە، چی ئەبوو ئەگەر "مێرت"ی لەو جێگایەی کە تێیدا خەوتبوو و ئەو جلە سپییانەی لەبەری کردبوو ڕزگار کردبایەو، هەموو ڕووتی ڕۆحی لە جەستەی "مێرت"دا قەتیس کردبا و

بڕۆیشتبانە شوێنێک کە کەس نەیدەتوانی بیدۆزێتەوە... ئەگەر ئێستا ڕۆیشتبونایە... ئەگەر ڕۆیشتبان...

بەڵام لە ئێستادا پزیشکەکە قسەی دەکرد و بەداخەوە گوێچکەکانی دەبوو گوێیان لەم ڕستە سەختانە بێت، "خاتوو ئێلچین" باسی نەخۆشیەکەی "مێرت"ی دەکرد، کە کاتی زۆری نەماوەو هیچ شتێک نیە بیکەن... "ئیلول" لەوێدا ڕووخا..

گرنگ نییە بچنە کام نەخۆشخانە و وڵات، هیچ شتێک نەبوو کە بتوانن بیکەن، بەداخەوە تەنها چوار مانگ مابویەوە لە تەمەنیدا، واتە ئەو ڕۆژە جوانانەی کە لە چەند مانگێکدا جێیان دەبێتەوە تەنها یەک کەس لەبیری دەبێت؟ واتە ئایا کۆرپەکەی نەیدەتوانی تەنانەت یەک جاریش دەست لە ڕوومەتی باوکی بدات؟

نەیدەتوانی هەست بە هیچ کام لەو شتانە بکات کە خانمە پزیشکەکە دوای ئەوە دەیگوت، ئەو بۆ ئەو خۆشەویستییە دەگریا کە لە بەهاری ژیانیدا ماڵئاوایی ئەبەدی دەکات، چۆن دەیتوانی ئەمەی بە "مێرت" گوتبا، یان "مێرت" وا بە بێدەنگی دەڕۆیشت ئەگەر "ئێلچین" بانگی نەکردبا و هەموو ئەمانەی پێ نەگوتبا؟

"ئیلول" لە ژوورەکە دەهاتە دەرەوە.. دەستی دەکرد بە ڕاکردن بەرەو لای "مێرت"، لە سەر جێگاکەی هەڵیدەگرت و بە

توندی لە باوەشی دەگرت، بۆنی دەکرد، ئەو خاکانەی کە پێی پێدادەنا، گوڵی بۆ دەچاند، هەموو ڕۆژێک وێنەیەکی بۆ دەکێشا، هەمیشە کتێبەکانی داهاتووی بۆ ئەو دەنووسی..

کاتێک چووە ژوورەکـە، "مێرت"یش چاوەڕێی دەکـرد، ئاگاداری ئەوە بوو کە چی ڕوویداوە و چی ڕوودەدات، پێی سەیر نەبوو، چونکە پێشتریش بەم شێوەیە دایکی لەدەستدابوو، نامۆ نەبوو بەم دۆخە، "ئیلول" ڕایکرد و لە باوەشی گرت و بۆنی کرد، لەمەودوا ڕۆحی دەبێتە ڕۆحی و جەستەی دەبێتە جەستـەی. "مێرت"یش دەستی بە قژی "ئیلول"دا دەهێنا، ڕوومەتەکانی دەست لێدەدا و بۆ ماوەیەکی زۆر نەیدەتوانی سەیری چاوەکانی بکات، دەیزانی دەبێت واز لە شتەکان بهێنێت و "ئیلول" لە نیوەی ڕێگا بەجێبهێڵێت، هەر بۆیە هەستی بە تاوان دەکرد.

دوای چوار ڕۆژ مانەوەیان لە نەخۆشخانە گـەڕاونـەوە ماڵەوە، ئێستا کات بۆ یەکتر کەم بوو، کاتێکی زۆریان نەمابوو، دەیانزانی، ئەو ڕۆژە خۆشانە بەم زووانـە کۆتاییان دەهات، "مێرت" دەچوو بۆ ئەبەدیەت و "ئیلول" لە چاڵە بێ بنەکاندا دەنێژرا، لەگەڵ ڕۆیشتنی "مێرت"، بۆچی ژیان ئەمەیان لەگەڵ دەکات؟

دەبوو شتێک بکات، بۆ بە هیوا بوون، شتێک بکات بۆ عەشق، بۆ کۆرپەکەی، ئەو هەفتەیەی لە نەخۆشخانە گەڕانەوە ماڵەوە،" ئیلول" ئاهەنگێکی هاوسەرگیری سوپرایزی بۆ "مێرت" ڕێکخست، بڕیار بوو هاوسەرگیری بکەن، دەبێت ژیان بەردەوام بێت، نابێت دەستبەرداری ئەو شتانەبن کە بڕیار درابوو بیکەن.

مێزێکی هاوسەرگیری و گوڵ و مۆم و شتەکانی دیکەیان ئامادەکردبوو، پێشتر قاتی زاواکەیان بە "مێرت" دابوو و گوتبویان دەچنە "کز کلوبێسی" بۆ نانخواردن، بڕیار بوو ئێوارەکەی "ئیلول" لە وەرشەکە ببەن و بەڕێکەون، "ئیلول" جلی بووکێنی لەبەرکرد و خۆی ئامادە کرد.

زانینی ئەوەی کە کۆتایی دەتوانێت لە هەر ساتێکدا بێت، کارەکتەری "ئیلول"ی گۆڕیبوو و وای لێکردبوو بێتەحەمول بێت، زوو تووڕە دەبوو، و کاردانەوەی ناپێویستی بۆ هەموو شتێک دەکرد، پاشان فرمێسکی بێ ئیرادەیی دەسڕییەوە، ئەو تا مردن لە لەدەستدانی "مێرت" دەترسا، لە کاتێکدا نەیدەوێرا بیر لەوە بکاتەوە کە بەبێ ئەو چۆن دەبێت، قورس بوو لەسەر گیانی کە ڕۆژێک دەبوو ئەم واقیعە ئەزموون بکات، دەستەکانی بە سکییەوە گرتبوو، دەستی لە کۆرپەکەی دەدا.

دوا شت کە دەیویست کۆرپەلەکەی هەستی پێبکات ئەو ترسە بوو، زیاتر گریا، زیاتر کۆرپەکەی خۆشویست، بەدەم

خۆیەوە گوتی: "کۆرپەلەکەم، هیوادارم باوکت بەختی ئەوەی هەبێت کە تۆ ببینێت، تکایە"، ئەویش هێشتا زۆر بچووک بوو بۆ ئەوەی کاردانەوەی هەبێت.

شتەکانی کۆکردەوە و ژوورەکـەی بەجێهێشت، چەند هـاوڕێیـەک و شایەتحاڵی هـاوسـەرگیری هـاتبـوون، ئێستا چاوەڕێی "مێرت" بوون، لە کاتی خۆیدا هات، وەک هەمیشە، کاتێک دەرگاکەی کردەوە و چووە ژوورەوە، هەموو شتێک وەک لە چیرۆکەکاندا هەیە ناوازە بوو.

کاتێک "مێرت" "ئیلول"ی بینی، چووە دەرەوە. ئـەو ڕای دەکرد، "ئیلول"یش بەدوایدا... بە درێژایی ڕێگاکە ڕایکرد تا کەنارەکە، بە گریانەوە . پێشتر پیاوێکی ئاوا خەمبار و شکاوی نەبینیبوو، دیار بوو زۆر بە ئازار بوو، بەڵام "ئیلول"یش خۆ ئەوەندەی خۆشدەویست کە لەگەڵیدا ئەویش دەمرد، نەیەبینی؟

نەیدەزانی چی بە مێشکی "مێرت"دا تێدەپەڕێت، "مێرت" بێزار بوو بوو لە شەڕکردن لەگەڵ خۆی هەموو ڕۆژێک. نەیدەویست ئەم ئازارە بەسەر "ئیلول"دا بهێنێت و لە تەنیشتیەوە بمرێت، "ئیلول" تێگەیشت کە لە مێشکیدا چی هەبوو. بە توندی "مێرت"ی لە باوەش گرت، پاڕایەوە، سوێندی خوارد کە بەرگەی هەر ئازارێک دەگرێت، "مێرت" ماندوو بوو بوو، لەسەر کورسییەکەی تەنیشتیان دانیشتن. کاتێک "مێرت" سەری لەسەر سنگی "ئیلول"

دانا، جارێکی دیکە دانی بەوەدا نا کە هەرخۆی ناتوانێت دوور لەم دەنگی دڵە بژی.

**دوای پیاسەیەکی دوور، ڕۆیشتنەوە ماڵەکەیان، و بۆ هەمیشە بە گریانەوە گوتیان بەڵێ، شایەتحاڵ و هاوڕێیان، هەمووان دەگریان، نەدەبوو بە ئاسانی ئەم شەڕە لەدەست بدەن... نەدەبوو عەشق لەدەست بدەن...**

"ئیلول" دەیویست هەفتەکان بە هێواشی تێپەڕن. هەر ڕۆژێک کە تێدەپەڕی لە کۆتاییدا نزیک دەبوونەوە و زریانەکانی ناخی گەورەتر و گەورەتر دەبوون، نەیدەزانی چەندی تر دەتوانێت بێهیوایی خۆی بشارێتەوە، هەرچەندە "مێرت" هەموو هەوڵێکی دا بۆ ئەوەی هیچ بۆ "ئیلول" ئاشکرا نەکات، بەڵام "ئیلول" دەیتوانی بیبینێت ئیتر بریقەی چاوەکانی کاڵ دەبووەوە، هەرچییەک بێت "ئیلول" دەبوو دڵخۆشی بکات، ڕەنگە باش بێت ئەگەر بزانێت کە بڕیارە منداڵێکیان ببێت و گوێ لە لێدانی دڵی بگرێت.

کاتێک کۆرپەکەیان تەمەنی شانزە هەفتە بوو، مانگی کانوونی دووەم تەواو بوو، و چوونە ناو ساڵێکی نوێی دیکەوە. "ئیلول" "مێرت"ی ڕازی کرد کە پێکەوە بچنە لای پزیشک، چونکە پێ گوتبوو کە هەست بە باشی ناکات، پزیشکەکەی بەناوی "کاک ئۆنور"، لەبارەی نەخۆشییەکەی "مێرت" دەیزانی، "ئیلول" لەسەر ئەو جێگایەی کە بڕیار بوو سۆنەرەکەی لێ بگیرێت پاڵکەوت، و "مێرت"یش لەسەر کورسی تەنیشت جێگاکە دانیشت، "کاک ئۆنور" سەرەتا دەنگی شاشەی سۆنەری دابەزاند و گوتی کە هیچ شتێکی گرنگ نییە، بارودۆخێکی کاتی بوو.

"مێرت" ئارام بووەوە، تەنانەت کاتێک بەڕێز "ئۆنور" دووبارەی کردەوە کە ئەم دۆخە لە پێنج مانگی تردا تێدەپەڕێت، "مێرت" هێشتا لەوە تێنەگەیشت کە مەبەستی چییە، بەو پێیەی پیاوان زۆر ئاشنا نەبوون بەم دۆخانە، پاشان کاک "ئۆنور" دەنگی ئەو ئامێرەی داگیرساند کە گوێی لە لێدانی دڵ دەبێت و هەواڵی دا کە دەبێتە باوکی کچێک، وەک ئەوە وابوو کە قفڵی لێدرابێت، چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسک، خۆشی، دڵتەنگی، بوونی، نەبوونی، هەموو هەستەکانی بە یەکجار هەبوو، باوەشیان کرد بەیەکدا و دەستیان کرد بە گریان، گوتی؛ یانی من فریشتەیەکی چاو دەریاییم دەبێت؟ دەگریا.

نە ئەو دەیتوانی کچەکەی ببینێت، نە کچەکەی دەیتوانی باوکی ببینێت، بەڵام ئەو لێدانی دڵانەی بۆ "مێرت" موعجیزەیەک بوو، ئیتر هەموو شەوێک دەستەکانی لەسەر کۆرپەکەی دادەنا و دەخەوت و بەیانیان بەوەوە بەخەبەر دەهات، شیعری بۆ دەنووسی، وە ئەو دڵە بچووکە هێشتا بێ ئاگا بوو لەوەی کە بە خۆشەویستی باوکی بۆی گەورە دەبێت.

دوای پێنج هەفتە... ئێوارەیەکی تری شوبات بوو، دیسان بەفرێکی کەم دەباری، دەنکە بەفرەکان ئەوەندە بە هێواشی دەکەوتنە خوارەوە کە وەک ئەوە وابوو سروشت بە جوڵەی خاو کار بکات ... "ئیلول" لە پەنجەرەی وەرشەکەوە سەیری شەقامە تاریکەکەی دەکرد، کە بە سپی داپۆشرابوو و هەوڵی دەدا تێبگات لە شەقەکانی کۆرپە بچووکەکەی، شتێکی سەیر ڕووی دەدا، هەردوو دەستی خستە سەر سکی و قسەی بۆ دەکرد، بۆ ئەوەی کۆرپەکەی ئارام بکاتەوە، لەم نێوەندەدا "مێرت" بانگی کرد، بەڵام گوێی لێ نەبوو، لە سێیەم هەوڵیدا بوومەلەرزەیەکی توندوتیژی لە مێشکیدا دروست کرد.

گوتی؛ "ئیلول وەرە لام، با بۆ دواجار دەست لە تۆ و کچەکەم بدەم"! کەمێکی دیکە ئەو پیاوەی خۆشی دەویست چاوەکانی دادەخست و هەرگیز جارێکی تر چاوەکانی نەدەکردەوە. "ئیلول" بڕیار بوو ئازارەکانی قبوڵبکات و لە وەرشەکەدا لەناو

دڵە بچووکەکەیدا بیانئێژێت، یان بیخاتە قووڵترینی خۆیەوە...

"ئیلول" لە تەنیشت جێگاکەی دانیشت و دەستی لە ڕوومەتی دا، کاتژمێر دە و بیست دەقیقە بوو، سارد بوو، دەلەرزی، دەترسا، هەر دڵۆپێکی ئارەقی سەر ناوچەوانی چیرۆکێکی جیاواز بوو، دەڕژایە ناو دەریای چیرۆکەکانەوە، خەریک بوو دەمرد، خەونەکانی کاڵ دەبوونەوە.

بە غەریبی کچە لەدایک نەبووەکەیەوە دەمرد، پەنجەکانی لە سکی "ئیلول"دا دەسووڕاندەوە، نەیدەویست دەستی لەسەر کۆرپەکەی لاببات کە بە قورسی پێی دەجوڵێندرا، "ناوی" دەیگوت "کل- کلل"... نەیتوانی تەواوی بکات، لێوەکانی وەک ئەوەی قفڵیان لێدرابێت داخران، فرمێسکەکان کەڵەکە بوون و بە ڕوومەتەکانیدا باران دەباری، کاتێک لە هەوڵدا بوو بۆ کردنەوەی چاوەکانی، ئەو دەڕۆیشت...

"ئیلول" دەیویست تا دەیتوانی هاوار بکات، دەیویست هاوار بکات تا دەگەیشتە عەرش، دەیویست لە باوەشی بگرێت و وا بمێنێتەوە، دەیویست لە کفنێکدا بپێچرێتەوە، لەگەڵ خاکەکەیدا بنێژرێت، دەیویست ببێت بە گیان بۆ جەستە بەجێهێڵراوەکەی، ئازاری ناو دڵی دەیکوشت و هەزاران خەنجەر لە هەمان شوێن چەقۆیان لێدەدا و خوێنی لێدەهات، دەستی بە ڕیشی "مێرت"دا دەهێنا کە خۆشدەویست، پاشان چاوەکانی و ڕوومەتەکانی

و قژی و دڵی... بۆچی ئەم دڵە گەورەیە و ئەم دڵە پڕ لە خۆشەویستییە ماڵئاوایان دەکرد؟

لە ماوەی دوو خولەکدا درەوشانەوەی دەموچاوی نەما و دەستەکانی دەستیان بە ساردبوونەوە کرد، چاوەکانی داخراوبوون، ئەو لێوانەی داخرابوون کە پێی دەگوت؛" ئیلولەکەی من". ئایا پاییزەکەیان ناوی "ئیلول" بوو؟ یان هاوینەکان، دوای ئەوە دەهاتن لە کاتێکدا دڵیان لە زستاندا گیری خواردبوو؟ ئایا چیرۆکەکانی بۆ کچە بچووکەکەی دەگێڕایەوە کە باوکی تێدایە، یان لەمەودوا تەنیا خۆی فریو دەدا؟

ئەو شەوە بە کەسی نەگوت، لە باوەشی جەستە ساردەکەی "مێرت" خەوی لێکەوت، ئەوە دوایین جار بوو کە ئەو سیانە پێکەوە دەخەوتن.

"ئیلول" هەستی کرد کە ڕۆحی "مێرت" بەجێیان دەهێڵێت، هەر وەکو ئەوەی لە پەنجەرەکەوە هات لەوێشەوە ڕۆشت، دواتر کاتی ماڵئاوایی بوو...

لە یەکێک لە شەوە تەنیاکانی مانگی ئازاردا "ئیلول" ون بووبوو، ڕێک دوو هەفتە تێپەڕیبوو کە "مێرت"ی لەدەستدابوو، ئەویش لە دۆخێکی نەبووندا بوو، ڕێک وەک چۆن مرۆڤ دەتوانێت لەکاتی ژیاندا بمرێت، دوو هەفتە بوو وەرشەکەی بەجێ نەهێشتبوو، هەرگیز پەردەکانی نەکردبووەوە، هێشتا

ڕانەهاتبوو کە بەبێ ئەو بخەوێت، لەسەر ئەو قەنەفەیەی کە "مێرت" بۆ دواجار دەستی گرتبوو چاوەڕێی دەکرد هەموو ئەمانە خەون بن. چاوەکانی کەوتنە سەر ئەو کاتژمێرەی کە بە دیوارەکەوە هەڵواسرابوو، نیوەی شەو تێپەڕیبوو، لە پەنجەرەکە نزیک بووەوە، ئەم شارە بچووکە بۆنخۆشە هێندە گەورە بوو کە تەنیاییەکەی نەیدەتوانی شوێن بدۆزێتەوە... هەناسەیەکی قوڵی هەڵمژی، ئەم با گەرمە کە سییەکانی پڕ دەکرد، ئەو گەڵا وشکانەی کە لە دڵیدا دانرابوون، هەواگۆڕکێی کردبوو.

چرای شەقامی سەر گۆشەکە دیسانەوە دەنکە بەفری دروست دەکرد، لەو ساتەدا "ئیلول" تێگەیشت کە ئەو تابلۆیەی کە دوو ساڵ لەمەوبەر لەم پەنجەرەدا ئیلهامبەخش بووە و دروستی کردووە، ڕاستییە، خۆشەویستیەکەی لەگەڵ دەنکە بەفر هات و لەگەڵ دەنکە بەفر ڕۆیشت، لەو ساتەدا دوا قسەکانی "مێرت"ی بیر کەوتەوە، یەکسەر لە ئینتەرنێتدا نووسی؛ "دەنکە بەفر". بە ئەنجامەکە زەردەخەنەی کرد، "ئیلول" تێگەیشت کە "مێرت" دەیەوێت لە ڕستەکەدا چی بڵێت کە ئەو ڕۆژە نەیتوانی تەواوی بکات.

کلوو... لە وەڵامی چەند لێدانێکی کچەکەیدا ئەو ناوەی دووبارە کردەوە کە باوکی پێی دابوو، تێگەیشت بۆچی "مێرت" تابلۆی دەنکە بەفری کڕی بوو، کە تەنانەت چیرۆکێکیشی نەبوو..

هەندێک چیرۆک پێویستییان بە گێڕانەوە نەبوو، بە جۆرێک چارەنووس لە هەموو کەسێک لێهاتووتر بوو، لە پڕکردنەوەی شوێنە بەتاڵەکان.

"تا ئەو کاتەی پێویستت بە کەسێکە
بۆ چاکبوونەوە،
بە تەواو نەکراوی دەمێنیتەوە"

## لە یادی باوکمدا...

## چیرۆکێک بووین، گەیشتینە کۆتایی...

خۆزگە هەموو شتێک وەک ئەو خەونانە دەبوو کە دەمبینی، کە لەکاتی خوێندنەوەی چیرۆکی پێش خەوتن خەوم لێدەکەوت، بەڵام وا نەبوو. چاوەکانم چەند جارێک کرانەوە و داخران، پاشان چەند جارێک و چەند جارێکی تر، هیچ نەگۆڕدرا، دڵی باوکم وەستا بوو! بۆ من ئەوەی لەو ساتەدا وەستا دڵێکی بچووک نەبوو، بەڵکو تەواوی جیهانێک بوو.

لەو ساتەدا هەستم کرد فیشەکێک لەناومدا تەقیەوە و دڵی شکاندم، وەک ئەوە وابوو کە هەر بەشێکی لە شوێنی جیاوازدا پەرش و بڵاو بووبێتەوە و هەرگیز یەک نەگرێتەوە، پەرش و بڵاوبوون، باوکم هەر جارێک شتێک ئازاری دەدا دەیگوت؛" ئەگەر بخەوین تێدەپەڕێت". خەوی لێدەکەوت، بەڵام تێنەدەپەری، ئەوە بووە هۆکاری ئەوەی بڕیارمدا ئەم کتێبە تەرخان بکەم بۆ باوکم، بە بیرکردنەوە لەوەی کە ڕۆژێک دێت

وەک چیرۆکێک ئازارەکانی دەگێڕێتەوە... ڕووی نەدا ...

زریانێکی گەورە لەناومدا درووست بوو، و لەگەڵیدا شەپۆلی زەبەلاح هەوڵیان دەدا ئەو یادگارییانە بڵاوبکەنەوە کە لە دڵمدا جێگیربووبوون.

دەڵێن دڵ هەست بە ئازاری ئازیزان دەکات، هەستم دەکرد، دەمزانی ئەو ئازارە گەورەیەی لە سنگمدا هەیە، بەهۆی ئەو ڕۆحەوە بووە کە دەیەوێت لە جەستەی باوکمدا ئازاد بێت، هەستێک وەک مردن لەکاتی ژیان و بەرزبوونەوە بۆ ئاسمان لەکاتی هەناسەدان... ئەو هەستە لە قووڵایی دڵمدا، تەواو دوور لە من... لەو ساتەدا، تێگەیشتم کە من چەندین کیلۆمەتر لە باوکمەوە دوورم و مەوداکەش ڕێگری لێنەکردم بە قووڵترین شێوە هەست بە ئازارەکە بکەم. ئەو شەوە چەند کاتژمێرێک چاوەڕێم کرد تا بزانم هێشتا باوکمان لەدەست نەداوە.

ئەو شتانەی پێشتر نەماندەتوانی بیڵێین، بە مێشکمدا تێپەڕین، وە دواتر ئەو شتانەی نەمانتوانی هاوبەشی بکەین، تێر تێر باوەشی یەکترمان نەکردبوو، سەرکەوتنەکان، ڕۆژە خۆشەکان، ئەو چیرۆکانەی کە بۆ نەوەکان دەگێڕدرێنەوە، منداڵیم لەبەر چاومدا دەچرا، ئەو خانووە سەوزە بچووکەم بیرکەوتەوە. بچووکتر بوومەوە، بووم بە منداڵ، لەناو ئەو چیرۆکانەدا ون بووم کە لە دەمی باوکمەوە گوێم لێدەگرت.

**زۆر تووڕەم لەو کەسانەی کە لە بچووکییەوە دەڵێن؛ ڕۆح ئازار ناچێژێت، ئەو شەوە، لە قووڵایی ناخمدا هەستم بە ماڵئاوایی ئەو ڕۆحە کرد.**

پاشان هەواڵەکە هات، بەم شێوەیە ئەزموونی ئەوەم کرد کە پێی دەڵێن فرمێسکی خۆشی، کە تەنها چەند جارێک لە ژیاندا دەدرێت بە مرۆڤەکان، منیش سوپاسگوزار بووم، نوێژم کرد، هیوادار بووم.

کاتێکی زۆری پێچوو تا تێگەیشتم کە باوکم زیندوو بووەتەوە، هەرچەندە بەشێکم دەیگوت؛ "باش دەبێتەوە، گەڕاوەتەوە"، بەڵام بەشەکەی ترم بەردەوام دەیگوت؛ "دۆخەکەیت بینیوە، تکایە ئامادەبە". تێگەیشتم کە مرۆڤ کاتێک بەو هەواڵە دڵتەزێنانە وێران دەبێت، ناتوانێت بەو ئاسانییە چاک بێتەوە. ئەوەی دوای ئەوە گوترا هیچ مانایەکی نەبوو، ئەو شەوە گریام، وەک ئەوەی باوکم لەدەست داوە، یەک من گریام، یەک ئاسمان...

**کاتێک باران دەبارێت دیار نییە کە بەندەکان چەند دەگرین، ڕەنگە هەر بۆیە گەورەترین ئازار هەمیشە لە باراناویترین ڕۆژەکان بدۆزرێتەوە.**

ئەو ڕۆژە و ڕۆژانی دواتر هەمیشە بەو شێوەیە بوون، باران هەرگیز نەوەستا، ژیان دڕندەترین لایەنی خۆی نیشان دا، پێش ئەوەی چانسی هەستانەوەمان هەبێت و بوەستینەوە ژیان لێیداینەوە، باوکم مرد، ژنێکی بێ خۆشەویستی، کوڕێکی بێ سبەی، نەوەیەکی بێ چیرۆکی بەجێهێشت و کۆچی دوایی کرد...

بۆ یەکەمجارە کرداری مردن جێگەیەکی وا گەورەی لە ژیانمدا گرتبوو، وە باوکم بەبێ ئەوەی دوا باوەشمان پێبدات ڕۆیشت، بەبێ ئەوەی پێمان بڵێت چەندە خۆشی دەویستین، نەمانتوانی پێی بڵێین بۆ دواجار چەندە خۆشمان دەوێت، دەڵێن باوکەکان زۆر کچەکانیان خۆشدەوێت، باوکم هەمیشە لە ناخیدا خۆشی دەویستم، هەمیشە خۆشەویستی خۆی لە دڵی خۆیدا دەهێشتەوە، ڕەنگە فێری خۆشەویستی نەبووبێت هەر بۆیە پێی وابوو کە خۆشەویستییەکەی کاتێک دەشاردرێتەوە بەنرختر

دەبێت، من هەڵە بووم کە پێم وابوو ڕۆژێک دێت دەڵێت زۆرم خۆشدەوێیت، هەموو ئەو شتانەی کە بڕیار بوو بیڵێین بوو بە گرێیەکی گەورە لە قوڕگماندا، ئەویش ڕۆیشت.

وەک ئەوە وابوو کات بە خێرایی بەرەو پێشەوە چووبێت و چەند سەدەیەک لە ئازاردا تێپەڕیبێت، ئەوانەی لەناکاو ئەو کەسەیان لەدەستداوە کە پێیان وابوو هەرگیز ژیانیان بەجێناهێڵێت، باش دەزانن من باسی چ جۆرە ئازارێک دەکەم، لەدەستدانی کەسێک کە هەموو بەیانییەک بە سوپاسگوزاری بوونی لە خەو هەڵدەستایت مەحاڵە وەسفی ئەو ئازارە بکەیت کە ئیتر دەزانیت ناتوانیت لە یەک بەیانی ژیانتدا بیدۆزیتەوە، منیش ناتوانم، لە باشترین حاڵەتدا دەمگوت؛" ئەمە دەرکەوتنی ناکاتیی چارەنووس بوو، ئێمە چیرۆکێک بووین و گەیشتینە کۆتایی، ئەگینا من ناتوانم بەرگەی ئەم بارە بگرم".

منیش بچووکم، تا ڕادەیەک بچووکم ... بەڵام ڕاستییەک هەیە کە دەبێت قبوڵ بکرێت؛ ئێمە بیرت دەکەین، زۆر بیرت دەکەین، و دەزانم ئەوەش هیچ ناگۆڕێت، چیرۆکی ئێمە بە خۆشی کۆتایی نایەت...

**مرۆڤ هەرگیز بەپێی پێویست گەورە نابێت، بۆ ئەو ئازارەی کە تێیدا ژیاوە**

# کاتێک کۆتایی هات...

**کات گەورەترین دیارییە**
**کە بە هەموو ژیانێک دەدرێت...**

کاتێک دەستم بەم کتێبە کرد، بانگهێشتی گەشتێکم کردیت، بڕیار بوو لە شەمەندەفەرێکدا بم کە گرنگ نییە بۆ کوێ دەچیت، و پێت بڵێم لە ماوەی ساڵانی ڕابردوودا چیم بۆت کۆکردوەتەوە، باسی ئەوەم بۆ کردیت سەرمای دەرەوە دەتوانێت هەموو خانەکانت بلەرزێنێت، سەرەڕای ئەوەی خۆر لە پەنجەرەوە دەدرەوشێتەوە، و ئەو خولەی کە پێی دەگوترێت ژیان هەمیشە لە هەمان ڕۆتیندا ناڕوات، هەندێک جار لە دڵخۆشیدا دەگەیتە هەورەکان، بەڵام ڕەنگە هەندێک جار نەزانیت چی بکەیت بۆ ئەوەی ئازاری دڵت لەبیر بکەیت، چۆن چەمکی دۆڕان بەهێزت دەکات و چەندین شتی تر... سوپاس بۆ ئەوەی دڵت نەشکاندم و لەگەڵمدا بوویت لەم گەشتە و باسکردنی یادەوەریەکانم هاوڕێ!

**گرنگ نییە ئەم کتێبە چۆن نووسراوە، تاکە ئامانجم ئەوە بوو کە نیشانتان بدەم کە خەڵک بە تێپەڕبوونی کات ڕادێن، بە جۆرێک یان بەو شێوەیە ... پێت وایە سەرکەوتوو بووین؟ سەرکەوتوو بووین یان شکستمان هێنا، نازانم.**

**گەیشتینە کۆتایی گەشتێکی تر، پێش ئەوەی ماڵئاوایی بکەم چەند قسەیەکم هەیە پێتان بڵێم، ڕەنگە نەتوانم نهێنی نەمریت پێشکەش بکەم، بەڵام ئەگەر گوێ بگریت دەتوانم بەردەکانی بناغەی دڵخۆشتر و بەهێزتربوون بخەمەڕوو.**

کاتێک دەستت کرد بە باوەڕکردن بەوەی کە ئەو یارییانەی لە منداڵیتدا کردووتە، هەرگیز جارێکی تر ناکرێنەوە، ئەو شتەی پێی دەگوترێت دونیا، دەسوڕێتەوە و تۆ تیایدا گەورە دەبیت، هاوڕێی ئازیز! بەڵام مەهێڵە کاتت پێ بچێت تا بزانیت گەورەبوون هیچ شتێک نییە لێی بترسیت.

بزانە هەر سەردەمێک دەرگا بەڕووی چیرۆکی جیاوازدا دەکاتەوە، با ئەمە کەمێک نهێنی بێت لە منەوە بۆ ئێوە، ڕابردوو قبوڵ بکە، بەهەر شێوەیەک بێت ئیتر تێپەڕیوە، هیچت نییە بیکەیت، ڕۆژەکەت لە باوەش بگرە، با داهاتوو کەشتییەک بێت کە جوانترین و خۆشترین ساتەکانی تێدا بێت کە هەمیشە خەونت پێیەوە بینیوە، شەڕی شەپۆلەکان بکە بۆ ئەو کەشتییە و هەمیشە کاپتنی کەشتیی خۆت بە.

مەهێڵە ئەو ڕێگا درێــژەی پێی دەگوترێت ژیان بتترسێنێت، دەکەویت، هەڵدەستیتەوە، ئەمرۆ دەدۆڕێیت، سبەی سەردەکەویت، وە هەر جارێک کە دەکەویت بەهێزتر هەڵدەستیتەوە، ناتوانیت ئەو ئازارەی ئەژنۆکانت لەبیر بکەیت کە لە هەموو کەوتنێکدا زیانیان پێدەگات، بەڵام دواتر تێدەپەڕێت، لەوانەیە بە دڵێک کە بەڕاستی دڵخۆشت دەکات، هەموو ئازارەکانت کەمبنەوە و هەموو لقەکانت گوڵ بکەن، ئازارەکانت لەبیر دەچێتەوە ئازیزم.

واز لە باوەڕکردن بەو پاکترین هەستە مەهێنە، واز لە باوەڕکردن بە عەشق مەهێنە، ئەگەر ببێتە هۆی ئارامیت کاتێک لێدانی دڵی بۆشایی سنگتی پڕکرد، کاتێک لە باوەشی دەکەیت، خۆشت بوێت، زۆر زۆریش، لە باوەشی بگرە.

سەرەڕای هەموو شتێک، بەردەوامبە لە بە ئومێد بوون، دەست درێژ بکە و ڕۆژە خۆشەکانی داهاتوو بگرە کە هەمیشە هەنگاوێک لە دوورەوەیە، هەرگیز خۆت مەدە بەدەستەوە، لە کات مەترسە، چونکە گەورەترین دیارییە کە تا ئێستا بە ژیان دراوە، لەبیرت نەچێ!

لە ڕاستیدا خەڵک بە تێپەڕبوونی کات لەگەڵ هەموو شتێک ڕادێت، بە پێی کات گەشە دەکات، بە تێپەڕبوونی کات خۆشی دەوێت، باوەڕ بە کات دەکات، بە پێی کات متمانە دەکات، بە پێی کات سەرکەوتوو دەبێت، بەڵام لە ساتێکدا دەشکێت، لە ساتێکدا دەدۆڕێت، بە تێپەڕبوونی کات ڕاهاتووین هاوڕێکەم... لە ساتێکدا ئازارمان چەشت، لە ساتێکدا دۆڕاین، بەڵام هەرگیز کۆڵمان نەدا، ئێمە هەرگیز لە هیوا و هەوڵدان بۆ ئەو داهاتووەی کە خەونمان پێوە دەبینی و بەدوای بەختەوەریدا نەوەستاین، چونکە کەسە باشەکان درەنگ یان زوو سەردەکەون.

دەزانیت ئێمە گەیشتینە کۆتایی گەشتەکەمان، بەم زووانە یەکتری لەباوەش دەگرین و ماڵئاوایی دەکەین، من دەمەوێت هەرگیز یەک شت لەبیر نەکەیت، ژیان زۆر کورتە و ئەمڕۆ دەرفەتێکە بۆ ئەوەی ئەم ژیانە کورتە بە تەواوی بژین...

**بە باش و خراپ و ڕاست و هەڵە، هیچ ژیانێکی تر جگە لەم ژیانە مومکین نییە.**

بۆیە سەرەتا باوەش بە ژیاندا بکە و دواتر من... نازانم کەی جارێکی تر یەکتر دەبینینەوە، نازانم کەی دەتوانین لەگەڵ یەکتر دابنیشین و قسە بکەین، و کەی دەچینە سەر یەک شەمەندەفەر، تەنها ئەوەندە دەزانم کە من بەقەد خۆت گرنگیت پێدەدەم، ئاگاداربە ئازیزم! ئاگاداری دڵت بە! وە لەبیرت نەچێت بۆم بنوسیت!

## به باش و خراپ و ڕاست و هەڵه، هیچ ژیانێکی تر جگه لەم ژیانه مومکین نییه.

بۆیه سەرەتا  باوەش به ژیاندا بکه و دواتر من... نازانم کەی جارێکی تر یەکتر دەبینینەوە، نازانم کەی دەتوانین لەگەڵ یەکتر دابنیشین و قسه بکەین، و کەی دەچینه سەر یەک شەمەندەفەر، تەنها ئەوەنده دەزانم که من بەقەد خۆت گرنگیت پێدەدەم، ئاگاداربه ئازیزم! ئاگاداری دڵت به! وه لەبیرت نەچێت بۆم بنوسیت!

“

مرۆڤ لەسەر قاچی نامێنێتەوە، لە ژیاندا دەمێنێتەوە. زۆر دەکەوێت، جارێکی تر هەڵدەستێتەوە؛ دڵتەنگ دەبێت، دەگری، جارێکی تر پێدەکەنێتەوە... لە کۆتاییدا هەمیشە هیوای ڕۆژانی باشتر دەخوازێت، چونکە هیوا گەورەترین کردارە کە مرۆڤ بە زیندوویی دەهێڵێتەوە.

”

**Tanya Haji | تەنیاحاجی**

public channel

Description

بسم الله الرحمن الرحیم
🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و بابەتی جیاواز🤍

ئەم کتێبە لەلایان سارا نامیق کراوە بە**pdf**
پێویستی بە دوعایە دوعای خێری بۆ بکەن

چەنال
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ کتێب مەینێرە↓
@tanyahaji22

ئەکاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22

t.me/tanyahaji7

Invite Link

# IYILER KAYBETMEZ

*kaybedilir*

به جانتایەکی پڕ لە چیرۆکەوە دەستدەکەم بە ڕێگاکەم، نازانم قەڵەمەکەم دەتوانێت فریا بکەوێت یان ئایا کامیان دەگاتە دەستت؟ تەنیا دەمەوێت بزانیت؛ ڕۆژێک دێت بە دڵنیاییەوە لە چیرۆکێکدا باست دەکەم.

کاتێک باران دەبارێت دیار نییە کە بەندەکان چەند دەگرین، ڕەنگە هەر بۆیە گەورەترین ئازار هەمیشە لە باراناویترین ڕۆژەکان بدۆزرێتەوە.

من دەمەوێت هەرگیز یەک شت لەبیر نەکەیت، ژیان زۆر کورتە و ئەمڕۆ دەرفەتێکە بۆ ئەوەی ئەم ژیانە کورتە بە تەواوی بژین...





کتێبخانەی گۆڵدن بووک
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
07701598762 - 07501444434


